

# داستانی یاوەران

## بەشی چوارەم

ئامادەکردنی

باوکی عبداللە

١٩٩٩ ز

١٤٢٠ ك

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# داستانی یاوەران

## بەشی چوارەم

ئامادەکردنی

**باوکی عبداللە**

لە بڵاوکراوەکانی ڕادیۆی دەنگی ئیسلام - هەولێر

١٤١٩ ١٩٩٩

بسم الله الرحمن الرحیم

ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر
ئەی ئەوانەی تاجی ڕێزی
تاهەتاییتان نا لەسەر
سڵاوتان لێ
سڵاوی بۆن گوڵاوتان لێ
ئێوە چرای هەڵگیرساوی
ئەم ژیانەن
لەوەتەی کاروانی ئیسلام بەڕێوەیە
تاکو ئێستا
ڕوویکاتە هەر خاکێ نێو هەر کۆمەڵێ
هەموو دەم لە هەرجێ بۆ سەربازەکانی
وەك ئامادە
ئێوە پێشەنگ
ڕێڕونکاری ئەم کاروانەن
بەڵێ ئێوە
لەنێو چیرۆكو سەر شانۆی ئەم بوونەدا
پاڵەوانن
بلندگۆی پەیامی ڕەوان
دەنگی زەنگی هەڵگیرساندنی شۆڕشو
ڕزگاربوونی گشت گەلانن
هێمان بۆمەردی و نەبەردی
بۆسەر دەستەیی ڕاپەڕین
بۆ خۆکردنە قوربانی دین
ناودارترینو دیارترین
کەسەکانی
ڕوی جیهانن
بەڵێ ئێوە
یادتان ڕەنگێکە تایبەتی

کێ دەیەوێ بتانبینێ
با ئەلبومی یەکێتان لە نێو ئەم ڕەنگە
هەڵداتەوە
جا گرنگ نی‌یە کامتانن
هەرکێتان بێ
تابلۆی ژینی
پڕ داستانو قوربانی‌یە
پڕ ماندووبونو تێکۆشان
سورو سوێرە
دوژمنو دوڕو ناتوانن
لێی بڕوانن
خۆشەویستان
چیتان باس کەم
کێتان باس کەم
ئێوە گشتتان وەك یەکتانن
یەکێکیشتان
وەك گشتتانن
گفتو کردەو جوڵانەوەی
ڕۆژانەشتان
هەموو جوانن
کێ بۆی دەکرێ ڕاڤەی ئێوە
زۆر مانای لەناو کۆدایە
ئێوە بروسكو گرمەی هەورن
کێڵگەو باخن
بارانی میوانی زەوین
مانای نەویستنی مانن

داود طاکی
هەولێر ١٩٩٩

{٦١}

# ﴿ابو عوبیدەی کوڕی جەراح﴾
# دڵسۆزی ئیسلام و موژدە پێدراوی بەهەشت

کێ بوو ئەو کەسەی پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ جەنگی ( ذات السلاسل ) بۆ بە هانا هاتنی عەمرو کوڕی عاص و کردی بە ئەمیر لەسەر سوپایەك ( ئەبوبەکرو عومەری ) تیا بوو ؟؟

ئەم یاوەرە بەڕێزە کێیە کەوا نازناوی ئەمیری ئەمیرانی لێنرا ... ؟؟

ئەم یاوەرە بەڕێزە کێیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی گرت و فەرمووی :-

هەر ئومەتێك دڵسۆزێکی هەیە ، دڵسۆزی ئەم ئومەتەش ( ابو عوبەیدەی کوڕی جەراحە ) ... ؟؟

بەڵێ ... کێیە ئەو دڵسۆزە بە هێزەی عومەری کوڕی خەتاب دەرهەقی دەیفەرموو کاتێك لەسەرەمەگ بوو :-

( ئەگەر ئەبو عوبیدەی کوڕی جەراح زیندوو بوایە لە شوێنی خۆم دام دەنا ، ئەگەر خوا دەربارەی پرسیاری لێکردبام ، دەمگووت :- دڵسۆزی خواو دڵسۆزی پێغەمبەرم ﷺ لە شوێنی خۆم دانا ... ؟ ) .

ئەم یاوەرە ڕوخسار نورانی و دەموچاو گەش و بە هەیبەت و ، لاشە لاوازو بەژن و باڵا بەرزو ناوشان باریك :- هەر کەسێك چاوی پێدەکەوت پێی دڵخۆش دەبوو و دەروونی دەگەشایەوەو دڵی پێی ئارام دەگرت .

دەبێ ئەم پیاوە قسەخۆش و بێفیزو بەشەرمە کێ بێت ؟ هەر کە کار لەکار ترازاو جەنگ گەرم دەبوو ئازایەتیت لێی دەبینی و هەروەك شێر پەلاماری دوژمنی دەدا و ، دەتگووت شمشێرە لە کالان دەرهاتووەو ڕەونەق دەداتەوە ، کاتێك هەڵدەکێشرا لە تیژیان پۆڵای دەبڕی و شاخ لەبەری شەق دەبوو ..

بەڵێ ... ئەم یاوەرە بەڕێزە دڵسۆزی ئوممەتی موحەممەدە نازناوی ( ئەبو عوبەیدە ) یەو ناوی تەواوی ( عامیر کوڕی عبداللە کوڕی جەڕاحی فیهری قورەیشییە ) ...

ئەم یاوەرە بەڕێزە ئەو مێرخاسەیە کەوا ( عبداللە)ی کوڕی عومەر - خوا لێی ڕازی بێت - دەرهەقی دەفەرموێت :-

(( سێ کەس لە قورەیش ڕووخۆشترین کەس بوون و ، لە هەموو کەس بە ڕەوشت تر بوون و ، لە هەمووان بەشەرم تر بوون ، ئەگەر قسەیان لەگەڵ کردبایت درۆیان لەگەڵ نەدەکردیت و ، وە ئەگەر قسەت لەگەڵ کردبان ڕاستیان دەکرد لەگەڵت ئەمانە :-

( ئەبوبەکری صدیق و عثمانی کوڕی عەففان و ئەبو عوبیدەی کوڕی جەراح بوون )) ..

ئەبو عوبەیدە یەکێك بوو لە موسڵمانە سەرەتا یەکەمەکان کەوا هاتە ناو ئیسلام ، لە دوای ئەو ڕۆژە بوو بە موسڵمان کە ئەبوبەکر تیا بوو بە موسڵمان ، هەروەها موسڵمان بوونیشی هەر لەسەر دەستی ئەبوبەکر بوو ، لەگەڵ ( عبدالرحمن کوڕی عەوف وعثمانی

کـــوڕی مظـــعون و ئەرقـــەمی کـــوڕی ئەرقـــەم ) ئیمـــامی ئەبوبـــەکر بردنیـــە لای پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەستی ووشەی هەقیان ئاشکرا کردو ، بوون بە کۆڵەگەی یەکەم بۆ ئەوەی کۆشكو تەلاری ئیسلامی مەزنیان لەسەر دروست بێت ...

ئەبو عوبـەیدە بەم تاقیکردنـەوە ناخۆشەدا تێپەڕی کـەوا موسڵمانان لـە سـەرەتا تـا کۆتایی لە شاری مەککە پێیدا ڕۆیشتن ، ئەوەبوو لەگـەڵ موسڵمانە بڕواردارەکان هـەموو جۆرە ئازارو ناخۆشیو خـەمێکی چەشـت کـەوا هیـچ بەدواکـەوتووانی ئـایینێك لەسـەر ڕووی جیـهان ئـەم جـۆرە ناخۆشـیەیان نەچەشـت . لەگـەڵ ئـەم کارەسـاتانە وورەبـەرز بوور ، لە هەموو هەڵوێستەکان لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستگۆ بوو ... بەڵام ئەو کارەسـاتەی ئـەبو عوبـەیدە لـە ڕۆژی بـەدر تووشـی هـات ، لـە گـەورەیی ئـەم ڕووداوە مەزەندەی مەزەندەکاران و خەیاڵی خەیاڵکاران دەوەستێنێت .

ئـەبو عوبـەیدە پاش گەڕانـەوەی لـە کۆچـی دووەمـی حەبەشـە یەکـەم جـەنگی کـەوا بەشداری تێدا کرد جەنگی بەدری گەورە بوو ئەبو عوبـەیدە ڕۆژی بـەدر دەهـاتو دەچوو لە نێو ڕیزەکانی بەهاتوچوونێك نەیدەزانیمردن مانای چییە !! هاوبـەش پـەیداکـەرانی بەجارێك تۆقاندبوو ، کاتێك لە نێوان ڕیزەکـان دەسـوڕایەوە ، سـوارچاکە قوڕەیشـیـیەکان خۆیـان لەبـەری لادەداو دەترسـان بـەرەنگاری ببنـەوە ، بـەڵام تەنـها یـەك پیـاو نـەبێت لـە هـەموو ئاراسـتەیەك خـۆی بـە ئەبوعوبـەیدە نیشـان دەداو دەهاتـە پێشـەوە ، بـەڵام ئەبوعوبـەیدە لـە ڕێگـای ئـەو لای دەداو حـەزی نـەدەکرد لـێی نزیـك بێتـەوە بـەرەنگاری بێتەوە ....

ئـەم پیـاوە چارەڕەشـە هـەر بـەردەوام بـوو لـە پـەلامار هێنـانو ، هـەموو ڕێگـایـەکی لـە ئەبوعوبـەیدە گـرتو ، وەسـتاو بـوو بـە بەرپـەرچ لـە نێـوان ئـەمو دوژمنـەکانی ، کـاتێك ئەبوعوبەیدە زۆری لێ بێزار بوو بوو، شمشێرێکی لە تەوقی سەری دا جەستەی کرد بە دوو لەتەوە ، یەکسەر پیاوەکە کەوتە ژێر دەستی ...

ئێنجـا ئـەی بـرای موسـڵمان ، مـەزەندە بکـە بزانـە ئـەم پیـاوە کـەوتـە ژێـر دەسـتی ئەبوعوبەیدە کێیە .... ؟ !!

ئەوەشمان گوت :- تاقیکردنەوەی ناخۆشو گەورە مەزەندەی مەزەندەکانو خـەیاڵی خەیاڵکاران دەوەستێنێت ..... !!

لە کاتێکدا بزانیت ئەم پیاوە کـەوتووە چارەڕەشـە بـاوکی ئەبوعوبەیدەیـە ( عبداللـەی کوڕی جەراحە لەوانەیە سەرسوڕمان بتگرێت ...

بـەڵام دەبـێ ئـەوە بزانیـت ئەبوعوبـەیدە بـاوکی خـۆی نەکوشـت بـەڵکو هاوبـەش پەیداکردنەکەی ناو دڵی باوکی کوشت !!

لەبـەر ئـەم ئـەم هۆیـە خـودای گـەورە دەربـارەی ئـەبو عوبـەیدەو دەربـارەی بـاوکی ئـەم ئایەتە قورئانیەی دابەزاندە خوارەوە .. کەوا دەفەرموێت :-

﴿ لا تجد قوما يؤمنون بالله و اليوم الآخر ، يوادّون من حادّ اللّـه و رسـوله ، ولـو كانوا آباءهم أو ابناءهم ، أو اخوانهم أو عشيرتهم ، اولئك كتب في قلوبهم الايمـان و أيّدهم بروح منه و يدخلهم جنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها رضي اللّه عنهم و رضوا عنه ، أولئك حزب اللّه ألا انّ حزب اللّه هم المفلحون ﴾ ...

ئەمە شتێکی سەیر نیە لە لای ئەبوعوبەیدە ، کەوا ئاستی هێزی بڕواهێنانی بەخواو گوێڕایەڵی بۆ ئایینەکەی و دڵسۆزی بۆ ئوممەتی موحەممەد گەیشتبووە ڕادەیەك زۆر دەروونی پاك و گەورە لە ڕێگای خوا خۆزگەی ئەم ئیمانەیان دەخواست .

هەروەك موحەممەدی کوڕی جەعفەر دەگێڕێتەوەو ، دەڵێت ، نوێنەرێك لە فەلەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گووتیان :- ئەی باوکی قاسم پیاوێك لە یاوەرەکانت لێی ڕازی بیت لەگەڵ ئێمە بنێرە بۆ ئەوەی فەرمان بکات لە نێوانمان لە هەندێك شت لە ماڵمان کێشەمان هەبوو لەسەری ، ئێوە ئەی کۆمەڵی موسڵمانان لە لای ئێمە چاکەخوازو جێگای ڕێزن ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

ئەم شەو دەرفەتم بدەن بۆ ئەوەی دڵسۆزێکی بەهێزتان لەگەڵ بنێرم . عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت :-

هەر بەزوویی چووم بۆ نوێژی نیوەڕۆ ، من هیچ کاتێك حەزم لە ئیمارەت نەکردووە ئەم ڕۆژە تکام وابوو ببم بە خاوەنی ئەم وەسفە ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی پێکردووین ، تەماشای ڕاست وچەپی خۆی دەکرد ، خۆم هەڵدەکێشا بۆ ئەوەی بمبینێت ، ئەوەبوو هەر چاوی دەگێڕا بە سەرمان تاکو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی بینی ، داوای لێکردو فەرمووی :-

لەگەڵیان دەرچەو فەرمان بکە لە نێوانیان بە هەق لەم کێشەی کەوا ناکۆکیان تێیدا کەوتووە ، منیش گوتم ئەبوعوبەیدە ئەم وەسفەی برد ...

ئەم ڕووداوەی ڕووی داوە ئەمە ناگەیەنێت تەنها ( ئەبو عوبەیدە ) جێگای بڕوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوە ... بەڵکو ئەم ڕووداوە ئەوە دەگەیەنێت ئەبوعوبەیدە یەکێك بوو لەوانەی ئەم مەدالیە زێڕینەی بردەوەو ئەم پلەوپایە بەرزەی پێدرا ...

ئەبوعوبەیدە – خوا لێی ڕازی بێت – تەنهاوتەنها سیفەتی دڵسۆزی بەخۆ نەگرتبوو بەڵکو سیفەتی هێزیشی لەگەڵ دڵسۆزیەکەی کۆکردبۆوە ، ئەم هێزو توانایەشی لە زۆر جێگا بەدیار دەکەوت ... :-

ئەم ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێك لە یاوەرەکانی ڕەوانە کرد بۆ گەیشتن بە کاروانەکانی قوڕەیش ئەبوعوبەیدەی لەسەر کردن بە ئەمیرو ، جۆرێك لە خورمای پێدان ، لەبەر ئەوەی لەم ساتەدا لە خورما زیاتریان لا نەبوو ، ئەبوعوبەیدە هەموو ڕۆژێك یەك دانە خورمای دەدا بە یاوەرەکان ، هەر یەکێکیان خورماکەی خۆی دەمشت هەروەك منداڵی شیرەخۆرە شیری دایکی دەمژێت ، پاشان ئاویان لەسەر دەکرد ئیتر ئەم دەنکە خورمایە بەشی ڕۆژێکی دەکرد تاکو شەو ، کاتێك خورماکە تەواو بوو دەستیان کرد بە خواردنی گەڵای دارو ئینجا ئاویان لەسەر دەخواردەوە ، لەبەر ئەوە ناویان لەم جەنگە نا جەنگی ( الخبط ) ....

لە ڕۆژی (ئوحود) کاتێك موسڵمانان شکستیان خوارد ، یەکێك لە هاوبەش پەیداکەران بانگی کرد :-

موحەممەدم نیشان بدەن ... موحەممەدم نیشان بدەن ...

ئەبوعوبەیدە یەکێك بوو لەم دە کەسەی کەوا دەورەی پێغەمبەری ﷺ دابوو بۆ ئەوەی بەرگری لێبکات و سینگی خۆی بداتە بەر ڕم و شمشێری گاوران ... کاتێك جەنگ تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ چوار ددانی پێشەوەی شکاو نێوچەوانی بریندار بووو

دوو بازنەی ئاسنی تیژ لە قەڵغانەکەی لە ڕوومەتی پیرۆزی چەقی ، ئیمامی ئەبوبەکری صەدیق – خوا لێی ڕازی بێت – لێی چووە پێشەوە بە نیازی دەرهێنانی لە ڕوومەتی پیرۆزی ، ئەبوعوبەیدە گووتی :–

سوێندت لەسەر دەخۆم ئەمە بۆ من بەجێدەهێڵیت ، ئەویش ڕازی هێنا ، ئەبوعوبەیدە لەوە ترسا ئەگەر بە دەست دەریبهێنێت پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاری پێبگات ، یەکەم بازنەی بە ددانی پێشەوەی بەهێز ڕایکێشاو دەریهێنا بەڵام ددانی پێشەوەی لەگەڵ کەوت ، ئیمامی ئەبوبەکر دەڵێت :–

ئەبوعوبەیدە لە هەموو کەسێك بەم ددان کەوتنە جوانتر بوو ...

ئەبوعوبەیدە بە دوای ئاڵای ئیسلام دا دەڕۆیشت ڕووی لە هەر شوێنێك کردبا هەروەك موجاهیدێك ، بەڵام بە هۆی بەهێزیی و دڵسۆزییەوە دەکرا بە ئەمیر جیات نەدەکردەوە لە موجاهیدان لەبەر بێ فیزیی و دڵسۆزییەوە ..

کاتێك ( خالیدی کوڕی وەلید ) سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی وەرگرت لە یەکێك لە جەنگەکان کەوا گەورەترین سەرکەوتنی بە دەست هێنا ، پاش ئەوەی ئیمامی عومەر جڵەوی خەلیفایەتی وەرگرت فەرمانی کرد بە دانانی ئەبوعوبەیدە لە شوێنی خالید ...

ئەبوعوبەیدە – خوا لێی ڕازی بێت – یەکسەر پێشوازی نەکرد لەم فەرمانەی ئیمامی عومەر ، بەڵکو ئەم هەواڵەی نەدرکاندو ، لە سینگی دڵسۆزو زاهیدو ژیری خۆی هەڵیگرت ، تاکو خالیدی سەرلەشکر ئەم سەرکەوتنە مەزنەی بەدەست هێنا

پاشان ، ئەبوعوبەیدە بە ڕەوشتێکی بەرز نامەی ئەمیری بڕواداراانی بۆ برد و ، خالید وەڵامی دایەوەو گووتی :–

(( خوا ڕەحمت پێ بکات ئەبوعوبەیدە ... چ شتێك قەدەغەی کردیت ئەم هەواڵەم نەدەیتێ هەرکە ئەم نامەت بۆ هات )) ...

دڵسۆزی ئیسلام وەڵامی دایەوەو گووتی :–

(( من حەزم نەکرد پیلانەکانی جەنگت لێهەڵبوەشێنمەوەو ، ئێمە گەورەیی دونیامان مەبەست نیەو ، بۆ دونیا کارناکەین ، هەموومان بۆ خودا برای یەکترین )) ...

لێرەدا ئەبوعوبەیدە بوو بە ئەمیری ئەمیران لە وڵاتی شام ، هەموو سوپای ئیسلام بە درێژایی و پانایی کەوتە ژێر فەرمانی ئەو .... بەڵام کاتێك دەتبینی موجاهیدێکی ئاسایی‌یەو جیات نەدەکردەوە لە موسڵمانان ....

کاتێك ئەبوعوبەیدە گوێی لێبوو خەڵکی شام باسی دەکەن و بە ئەمیری ئەمیران بانگی دەکەن کۆی کردنەوەو وتارێکی بۆ دان :–

برایانی موسڵمان تەماشا بکەن چی بەمانە دەڵێت کەوا سەریان سوورماوە لە هێزو دڵسۆزیی و مەزنیەتی ئەم پیاوە :–

(( ئەی خەڵکینە .... من موسڵمانێکم لە قوڕەیش .... هەر یەکێك لە ئێوە ، چ سوور بێت چ ڕەش بەخواپەرستی لەمن گەورەتر بێت ئەوا لە ژێر فەمانی ئەو دەبم )) .

ئینجا برایان سەرنج بدەنە ناسنامەی ئەمیری ئەمیران چ فەرمانێك دەردەکات و ، ناسنامەکەی چی لێنووسراوە ، تەنها ووشەی ئیسلام و هۆزی قوڕەیش بەبێ ئەوەی پلەی سەرکردایەتی و لێپرسراویەتی لێ بنووسرێت ... لەگەڵ ئەوەش ئەمیری ئەمیرانەو ، فەرماندەی زۆربەی سوپای زل هێزی موسڵمانانە ...

ئەمیری بڕوادران ( عومەری کوڕی خەتتاب ) سەردانی ئەبوعوبەیدە دەکات‌و، پرسیار لە پێشوازی کاران دەکات :-
کوانێ برام .... ؟؟
ئەوانیش دەڵێن کامە ... ؟
وەڵام دەداتەوە :- ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح ...
ئەبوعوبەیدە دێت بەرەو پیریەوەو ، دەست لە ملی ئەمیری بڕواداران ( ئیمامی عومەر ) دەکات‌و ... پاشان دەیباتەوە ماڵەوەی ، ( ئیمامی عەمەر ) هیچ کەرەستەیەکی ماڵ نابینێت ... تەنها شمشێرێك‌و ، کورتان‌و زرێیەك نەبێت ...
( ئیمامی عومەر ) زەردەخەنە دەیباتەوەو دەڵێت :-
(( ئایا شتێکت بۆ خۆت دانەناوە هەروەك خەڵك دایدەنێت ... ؟ ))
ئەبوعوبەیدە وەڵام دەداتەوەو دەڵێت :-
(( ئەی ئەمیری بڕواداران ، ئەمە دەمبات بۆ جێگای پرسیار کردن )) !!
ئەبو عوبەیدە هەموو دیمانەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بینیووە لەم ڕۆژەی بوو بە یاوەری تاکو ڕۆژی کۆچی یەکجارەکی ...
لە ڕۆژی سەقیفە ئەم ڕۆژەی موبایەعە درا بە خەلیفە ئەبوبەکر ، ئیمامی عومەر بە ئەبوعوبەیدەی گوت :- دەستت درێژ بکە بۆ ئەوەی موبایەعەت بکەم ، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووەو فەرموویەتی
(( ان لكل امة أمينا ، و انت أمين هذه الامة )) ...
واتە :- هەر ئومەتێك دڵسۆزێکی هەیە ، تۆ دڵسۆزی ئەم ئوممەتەی ...
ئەبوعوبەیدە دەڵێت :- ناتوانم دەستم بە پێش یەکێك بیەخم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد ئیمامەتیمان بۆ بکات لە نوێژ ، بووە ئیماممان تاکو مرد
پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوعوبەیدە موبایەعەی دا بە ئیمامی ئەبوبەکری صەدیق ئەبوعوبەیدە باشترین ئامۆژگاری کاری بوو لە هەق‌و ، باشترین یارمەتیدەری بوو لە چاکە ...
پاش ئەبوبەکری صەدیق جڵەوی خەلافەت درا بە ئیمامی عومەر ، ئەبوعوبەیدەش پێی ڕازی بوو گوێڕایەڵی کردو لە هیچ فەرمانێکی خەلیفە دەرنەچوو ، تەنها یەك جار نەبێت
ئێجا ئەی برای موسڵمانم دەزانی ئەم فەرمانە چی بوو کەوا ئەبوعوبەیدە لەژێر فەرمانی خەلیفەی ئیسلام دەرچوو ؟
ئەمە کاتێك ڕووی دا ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی دەکرد لە وڵاتی شام لە سەرکەوتنێك بۆ سەرکەوتنێك تاکو خوای گەورە لەژێر دەستی هەموو وڵاتی شامی ڕزگار کرد لە ڕۆژهەڵات گەیشتە زێی فورات و لە باکوور ئاسیای بچووك ( تورکیا ) ....
لەم کاتانەدا وڵاتی شام تووشی نەخۆشی طاعون هات خەڵك لە ژیانیان شتی وایان بە چاوی خۆیان نەبینیبوو ، هەروەکو داس خەڵکی دەدوریەوە ، کاتێك ئیمامی عومەر بەمەی زانی نوێنەرێکی بۆ ئەبوعوبەیدە نارد بە نامەیەك تێیدا نووسیبوو :-

من كارێكم بە تۆ هەیە هیچ چارەسەریم نیە ، ئەگەر نامەی منت بە عسر بەدەست گەیشت من فەرمانت پێدەكەم بەیانی نەكەیتەوە تاكو سوار نەبی و بەڕێ نەكەویت ، ئەگەر بە ڕۆژ بە دەستت گەیشت من فەرمانت پێدەكەم ئێوارە نەكەیتەوە تاكو سوار نەبی و بەڕێ نەكەویت ...

كاتێك ئەبوعوبەیدە نامەی ئیمامی عومەری بە دەست گەیشت گوتی :-

من دەزانم ئەمیری بڕواداران چ كارێكی پێم هەیە ، دەیەوێت یەكێك بهێڵێتەوە مانەوەی نابێت ، پاشان بۆی نووسیەو گوتی :-

ئەی ئەمیری بڕوادارن ، من دەزانم چ كارێكت بە من هەیە ، من لە نێو سەربازە موسڵمانەكانم و حەز ناكەم خۆم جیابكەمەوە لەوەی كە ئەوان تووشیان دەبێت و ، نامەوێت لێیان جیاببمەوە تاكو خوای گەورە فەرمانی خۆی بەسەر من و ئەوان بڕیار دەدا ، ئەگەر ئەم نامەی منت بەدەست گەیشت گەردنم ئازا بكەو ، ڕێگای مانەوەم بدە ....

كاتێك ئیمامی عومەر نامەكەی خوێندەوە گریا تا فرمێسك لە چاوەكانی هاتە خوارەوە ، ئەوانەی لای پێیان گوت ( لەبەر زۆری گریانی ) :-

ئایا ئەبوعوبەیدە مردووە ئەی ئەمیری بڕواداران ؟

ئەویش گوتی :- نەخێر بەڵام مردن لێی نزیك بۆتەوە ...

ئیمامی عومەر لەم قسەیەی بەهەڵەدا نەچووبو ، بە هۆی مانەوەی ئەبوعوبەیدە تووشی نەخۆشی طاعون هات و ، كاتێك مردن لێی نزیك بۆوە وەسیەتی موجاهیدەكانی بەمە كرد :-

من وەسیەتتان دەكەم بە وەسیەتێك ئەگەر وەری بگرن هەر لەسەر چاكە دەمێننەوە :-نوێژەكانتان بكەن و ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن و ، خێرو صەدەقە بكەن و ، حەج و عەمرە بكەن ، هاتوچۆی یەكتر بكەن و ، ڕاستگۆ بن لەگەڵ ئەمیرەكانتان و ، فێڵیان لێمەكەن و دونیا بە فەوتانتان نەداو ، ئەگەر كەسێك هەزار ساڵ تەمەنی بێت ئەوا مەحاڵە چارەنووسی وەكو من دەبێ هەروەك ئێوە دەیبینن ...

والسلام علیكم ورحمة الله وبركاته ....

پاشان ئاوڕی لە مەعاذی كوڕی جەبەل دایەوەو گووتی :-

ئەی مەعاذ نوێژ بۆ خەڵك بكە .

پاشان ئەوەندەی نەبرد گیانی پاكی بەرەو فیردەوسی ئەعلا بەرز بۆوەو ، مەعاذ هەڵسایەوەو گوتی :-

ئەی خەڵكینە ، ئێوە بە هۆی ئەم پیاوە كارەساتتان بەسەر هات ، سوێند بە خوا نازانم من پیاوی وا چاكە خوازم بینیبێ دوور بێت لە حیلەو خراپەو كەس نەبووە وەك ئەو حەز بە بارەگای خوا بكات و زیاتر ئامۆژگاری خەڵك بكات ، سۆزتان بۆی هەڵسێ خوا ڕەحمتان پێ بكات ....

ڕەحمەتی خوا لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ و دڵسۆزی ئیسلام و مژدە پێدراوی بەهەشت ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاح ...

* * *

## ٦٢

# ﴿ عبدالرحمن كوڕى عــەوف ﴾

## ئەو کەسەی ماڵ و گیانی بۆ خوا فرۆشت و مژدەی بەهەشتی پێدرا

## {٦٢}

# ﴿عبدالرحمن كوڕی عەوف﴾

## ئەو کەسەی ماڵوگیانی بۆ خوا فرۆشتو مژدەی بەهەشتی پێدرا

ئەم یاوەرە یەکێکە لەم دە کەسەی لە سەرەتادا هاتنە ناو ئیسلام

یەکێکە لەم دە یاوەرەی مژدەی بەهەشتی پێدرا

یەکێکە لەم شەش کەسەی هەڵبژێردران بۆ ڕاوێژی دیاری کردنی خەلیفە پاش ( ئیمامی عومەر )- خوا لێی ڕازی بێت -

یەکێکە لەم یاوەرانەی فتوای لە مەدینە دەداو پێغەمبەری خوا ﷺ زیندوو بوو لە نێو موسڵمانان

لە کاتی نەزانیدا ناوی ( عبد عمرو ) بوو ، کاتێك موسڵمان بوو پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد بە ( عبدالرحمن )

ئینجا ئەمەیە (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) - خوا لێی ڕازی بێت -

(عبدالرحمن کوڕی عەوف ) پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت بۆ ماڵی ئەرقەم بووە بە موسڵمان پاش ئیمامی ئەبوبەکر بە دوو ڕۆژ ...

تووشی ئازارو ئەشکەنجەی بێباوەڕان بوو لە پێناوی خوادا هەروەك موسڵمانە سەرەتاکان تووشیان بوو ئارامی گرت چۆن ئەوان ئارامیان گرت ، وورە بەرز بوو هەروەك ئەوان وورە بەرز بوونو ڕاستی کرد هەروەك ئەم موسڵمانانە ڕاستیان کرد ، لە پێناوی ئایینەکەی کۆچی کرد بۆ حەبەشە هەروەك زۆربەیان کۆچیان کرد

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان کۆچکردووەکانو یاریدەدەرەکان برایەتی خستە نێوان ( سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری و عبدالرحمن کوڕی عەوف ) - خوا لێیان ڕازی بێت - . سەعد بە براکەی عبدالرحمن کوڕی عەوفی گوت :-

ئەی برام :-

من لە هەموو خەڵکی مەدینە دەوڵەمەندترمو ، دوو باخچەم هەیەو ، دوو خێزانم هەیە ، تەماشا بکە کام باخچەت لەلا چاکترە تاکو بۆت لێی بێمە دەرەوە بەکام خێزانم ڕازی تاکو بۆت تەڵاق بدەم

عبدالرحمن بە برا ئەنصارییەکەی گوت :-

خودای گەورە خێزانو ماڵت پیرۆز بکات بەڵام بازاڕم پێ نیشان بدە بازاڕی نیشان داو بازرگانی کرد ، بەردەوام بوو لە کڕینو فرۆشتنو ، قازانجی کردو سەرمایەی زیادی کرد

زۆری نەبرد تاکو پارەی مارەیی ئافرەتێکی پەیدا کردو ژنی هێنا ، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی لە خۆی دابوو

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ها ئەی عبدالرحمن !!!

عبدالرجمن گوتی :-

ژنم هێناوه      فەرمووی      چیت داوە لە مارەیی بۆ خێزانەکەت ؟!
عبدالرحمن گوتی :- کێشی ناوکە خورمایەك لە زێڕ ... فەرمووی حەیوانێك سەرببڕە ئەگەر مەڕێك بێت ، خوا ماڵت پیرۆز بکات
عبدالرحمن دەڵێت :-
دونیام وا بەسەرداکەوت تاکو تەماشات دەکردم ئەگەر بەردێکم بڵند بکردبایە وات دەزانی زێڕ یان زیوی لە بنە
لە ڕۆژی بەدر ( عبدالرحمن ) جیهادی ڕێگای خودای کردو دوژمنی خودا ( عومەیری کوڕی عثمان کوڕی کەعبی تەیمی ) کوشت ...
لە ڕۆژی ئوحد لە شوێنی خۆی چەسپا کاتێك پێیەکان لە مەیدانی جەنگ لەرزین و ، ئارامی گرت و ڕووبەڕووی دوژمن بۆوە کاتێك هەڵاتووەکان مەیدانی جەنگیان بەجێهێشت و ، کاتێك جەنگ تەواو بوو بیست و هەندێك برینی لە لەشیدا بوو ، هەندێکیان قووڵ بوون دەستی پیاوی دەچووە ناوی ...
بەڵام جیهادی (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) بە گیانی زۆر لە کورتی دەدات ئەگەر بیکێشین بەرامبەر جیهاد بە ماڵی
ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت تیپێك ئامادە بکات ، دەوەستێت بەرامبەر یاوەرەکانی و دەفەرموێت :- (( صەدەقە بکەن من دەمەوێت نوێنەرێك ڕەوانە بکەم ))
(عبدالرحمن کوڕی عەوف ) بە خێرایی دەگەڕێتەوە ماڵەوەو پاشان بە خێرایی دەگەڕێتەوەو دەڵێت :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چوار هەزارم هەیە :-
دوو هەزارم بە قەرز داوە بە خواو ، دوو هەزاریشم بەجێهێشتووە بۆ ماڵەوە
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-
(( بارك الله لك فيما أعطيت ... وبارك الله لك فيما امسكت      ))
واتە :- خودا بەرەکەت بهاوێتە ئەو ماڵەی بەخشییوتەو ، خودا بەرەکەت بهاوێتە ئەو ماڵەی هێشتووتەوە
هەروەها کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی جەنگی (تەبوك)ی دا ... ئەم جەنگە کۆتا جەنگی لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر پێویستییان بە ماڵ هەبوو نەك پێوسیتی پیاو سوپای ڕۆم ژمارەی زۆرو کەرەستەی زۆر بوو ، ئەم ساڵیش لە مەدینە ساڵی نەهات بوو سەفەرەکەش درێژ بوو ، ئازووقەش کەم بوو ، سواریش کەم بوو تاکو هەندێك لە موسڵمانان دەهاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە نادڵی دەگەڕانەوە لەبەر ئەوەی هیچی نەبوو هەڵیان بگرێت و لەگەڵ خۆی بۆ جیهادکردنیان ببات ، بۆیە کە دەگەڕانەوە چاویان پڕ بوو لە فرمێسك و لە خەمی ئەوەی هیچ شتێکیان لەبەر دەست نەبووە پێی ئامادەیان بکات ...
ناویان لەم کۆمەڵە خەڵکە نا ( گریاوەکان ) ، ناویشیان لەم سوپا نا سوپای ( زەحمەت ) ، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە یاوەرەکانی کرد بە ماڵ بەخشین لە ڕێگای خواو پاداشتەکەشی لە لایەن خوا بێت ، موسڵمانان دەرچوون بۆ بەپیرهاتنی بانگەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) یەکێك بوو لە پێشەنگە ماڵ بەخشکەرەکان و ، دووسەد ئوقیەی زێڕ ماڵی بەخشی ، عومەری کوڕی خەتتاب بە

پێغەمبەری خوای ﷺ گوت :- من وا دەبینم عبدالرحمن گوناهێکی گەورەی کردبێت هیچی بۆ ماڵەوە بەجێنەهێشتووە
پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( عبدالرحمن )ی فەرموو :-
ئایا هیچ شتێکت بۆ ماڵەوە بەجێهێشتووە ؟
ئەویش گووتی :- بەڵێ بۆم بەجێهێشتوون زیاتر لەمەی بەخشیوومە
فەرمووی چەند ؟
عبدالرحمن گوتی :-
لەم ڕزق و چاکەو پاداشتەی خواو پێغەمبەرەکەی بەڵێنیان داوە .
سوپای ئیسلام بەرێکەوت بۆ تەبوك ... لێرەدا خودای گەورە ڕێزێکی وای لە (عبدالرحمن کوڕی عەوف )نا هیچ موسڵمانێك ڕێزی بەم جۆرە لێ نەنرابوو ، کاتی نوێژ هات ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە نەبوو (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) ئیمامەتی بۆ موسڵمانان کرد ، هێشتا ڕکاتی یەکەم تەواو نەبوو بوو تا پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە نوێژکەران ، ئیقتیدای کرد بە (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) و نوێژی لەدوا کرد ....
ئینجا ئایا لێرەدا هیچ ڕێزێك هەیە گەورەتر بێت لەم ڕێزەی لە عبدالرحمن نرا کەوابوو پێش نوێژی گەورەی هەموو ئادەمیزاد و پێشەوای پێغەمبەران ( موحەممەدی کوڕی عبدالله ) ؟!!
کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە بارەگای خوا ، (عبدالرحمن ) هەڵدەستا بە جێبەجێکردنی کاروباری دایکانی موسڵمانان و ، پێویستییەکانی بۆ ڕادەپەڕاندن ، لەگەڵیان دەچووە دەرەوە ئەگەر پێویستیان بە دەرەوە بوایە و ، حەجی لەگەڵ دەکردن ئەگەر نیازی حەجیان بوایە ، ژووری سەرپشتی ووشتری بۆ چاك دەکردن و ، لەگەڵیان دادەبەزی لەم شوێنەی بیانویستایە دابەزن ، ئەمەش یەکێك بوو لە کردەوە چاکەکانی (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) جێگای بڕوایی دایکانی موسڵمانان کەوا جێگای شانازی سەربەرزی ئەوان بوو .
چاکەی (عبدالرحمن کوڕی عەوف ) گەیشتبووە پلەیەك بۆ موسڵمانان و دایکانی موسڵمانان ، ( عبدالرحمن ) زەوییەکی بە ( چل هەزار دینار) فرۆشت هەر هەمووی بەسەر نەوەی زوهرە هۆزی دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەژارە موسڵمانەکان و کۆچکردووەکان و، خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەش کرد
کاتێك بە شەماڵی دایکی موسڵمانان عائیشە - خوا لێی ڕازی بێت - گەیشت ، گوتی :-
پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :- تەنها ئارامگرتووەکان لە دوای من بە خەمتانەوە دێن ....
ئەم دوعایەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (عبدالرحمن کوڕی عەوف )ی کرد کەوا بەرەکەت بکەوێتە ماڵی وەکو سێبەر لەگەڵ ژیانی درێژ بووەوە . تاکو بوو بە دەوڵەمەندترین یاوەرو ، بازرگانییەکانی ڕۆژ بە ڕۆژ گەشەی دەکرد و زیادی دەکرد ، کاروانەکانی لە کارکردن دابوو یان لە مەدینە دەردەچوو یان دەهاتە ناو مەدینە

باری گەنمو ئاردو ڕۆنو جلوبەرگو قاپوقاچاغو بۆنی هەڵدەگرت بۆ خەڵکی شارو وە هەر شتێك كە پێویستییان پێ بوایە ...

هەروەها ئەو پێویستییە زیادەی كە لە بەرهەمەكانیان زیاد دەبوو بۆی دەگواستنەوە دەرەوەی شار....

ڕۆژێك لە ڕۆژان كاروانەكانی (عبدالرحمن كوڕی عەوف ) بەرەو مەدینە دەهات ، پێكهاتبوو لە حەوت صەد بار هەڵگری وڵاخ ...

بەڵێ حەوت صەد بارهەڵگری وڵاخ ... كەوا لەسەر پشتیان خواردنو ، كەلوپەلو هەموو پێویستییەكانی خەڵكی هەڵگرتبوو ... هەر كە گەیشتە ناو شاری مەدینە زەوی لەبەر پێی وڵاخەكان دەلەرزییەوە ، گوێی خەڵكی مەدینەی كاس كردبوو ، عائیشە – خوا لێی ڕازی بێت – گوتی :–

ئەم تەپوتۆزە چییە ؟ پێیان گوت :–

كاروانەكەی (عبدالرحمن كوڕی عەوف )ە ... حەوت صەد وڵاخ باری گەنمو ئاردو خۆراكی هەڵگرتووە.....

عائیشە – خوا لێی ڕازی بێت – گوتی :–

خوا بەرەكەت بهاوێتە ناو ئەوەی لە دونیا پێی بەخشراوە پاداشتی ڕۆژی دوایشی مەزنترە ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو :

(( يدخل عبدالرحمن بن عوف الجنّة حبوا )) ...

واتە :– (عبدالرحمن كوڕی عەوف ) بە گاگۆلكێ دەچێت بۆ بەهەشت ...

پێش ئەوەی وشترەكان چۆك بدەن ، مزگێنیدەر قسەی دایكی موسڵمانانی بۆ (عبدالرحمن كوڕی عەوف ) بردو مزگێنی بەهەشتی پێدا

هەر كە ( عبدالرحمن ) ئەم مزگێنییەی بیست ، وەكو ئەوەی بفڕێت بە خێرایی چووە لای عائیشەو پێی گوت :–

ئەی دایكە ، ئایا تۆ ئەمەت لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ لێ بووە ؟!

گوتی :– بەڵێ ...

لە كەیف خۆشیان باڵی گرت و گوتی :–

ئەگەر بتوانم بە هەڵسانەوە بۆی دەچمە ژوورەوە ... ئەی دایكە تۆ دەكەم بە شاهید ئەم كاروانانە بە بارو بە پشتێنو ئەوەی لەسەر پشتیەتی بۆ ڕێگای خودا ....

لەم ڕۆژە پرشنگدارە خۆشە ... لەم ڕۆژەی (عبدالرحمن كوڕی عەوف ) مزگێنی پێدرا بە چوونی بۆ بەهەشت زیاتر لە جاران ماڵی خۆی دەبەخشی لە ڕێگای خوا

وای لێهاتبوو بە هەردوو دەستی ڕاستو چەپ ، نهێنیو ئاشكرا ماڵی دەبەخشی ، كەوا چل هەزارْ درهەمی زیوی بەخشی ، پاشان چل هەزار دیناری زێڕی تری بەخشی پاشان پێنج سەد وڵاخی بۆ موجاهیدان لە ڕێگای خودا بەخشی ، لە دوای ئەم هەزارو پێنج سەد بار هەڵگری تری بە موجاهیدان بەخشی

كاتێك مردن لە (عبدالرحمن كوڕی عەوف ) نزیك بووەوە ژمارەیەكی زۆر لە بەندەكانی ڕزگار كرد

وەسـیـەتی کـرد هـەر پیـاوێك بەشـداری جـەنگی بـەدری کردبێـت لـە ژیـان مـابێت چوارصـەد دینـاری زێـڕی پـێ ببەخشـن ، هـەموویان وەریـان گـرت ، ژمارەیـان صەد کەس دەبوو ....

عبدالرحمـن وەسـیـەتی کـرد هـەر یـەکێك لـە دایکـانی موسـڵمانان مـاڵێکی زۆریـان بدەنێ ، تاکو دایکی بڕواداران عائیشە – خوا لـێی ڕازی بێت – زۆر جاران دوعای بۆ دەکردودەیگووت :-

خوا لە کانی سەلسەبیل ئاوی بدات ....

پاشـان لـە دوای هـەموو ئەمانـەش سـامانێکی ئـەوەندە زۆری بـۆ میراتگرەکـانی جێهێشت ناتوانرێت مەزەندەی بۆ بکرێت ... کەوا هـەزار وشتر و صـەد ئەسپ و ، سێ هـەزار مـەڕی جێهێشـتەو ، چوار خێزانی هـەبوو هەریەکـەیان چوارییـەکی هەشـتیەکیان بەرکەوت کەوا دەکاتە هەشتا هەزار ....

ئەوەندەی زێڕوزیو بۆ میراتگرەکانی جێهێشت کەوا دابەش دەکراو لەت دەکرا بە تەور تاکو وای لێهات کرێکارەکان ئەوانەی زێڕو زیوەکانیان لەت دەکرد دەستیان ئازاری پێ گەیشت ...

ئەمانەش هەر هەمووی بە هـۆی گـەورەیی دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کەوا بەرەکەت بکەوێتە ناو سامانی

بـەڵام لەگـەڵ ئـەم هـەموو دەوڵەمەندیـەش (عبدالرحمـن کـوڕی عـەوف ) نـەگۆڕاو مـاڵی دونیا کاری لێنەکرد ، خەڵك کاتێك لـەنێو کۆیلـەکان دەیـانبینی جیاوازیـان نـەدەکرد لـە نێوانیان .

ڕۆژێك خواردنیان بۆ هێنا ئەویش بەڕۆژوو بوو تەماشای خواردنەکەی کردو گوتی :-

کاتێك موصعـەبی کـوڕی عومـەیر شـەهید بـوو – ئـەو لـەمن باشـتر بـوو – هیچمـان بەدەست نەکەوت بۆی کفنی بکەین تەنها کفنێك نـەبێت ئەگـەر سەرمان پـێی داپۆشـیبا پێیەکانی بەدیار دەکەوت ، وە ئەگەر پێمان پێی داپۆشیبا سەری بەدیار دەکەوت

پاشان خوا ئەوەی لە دونیا پێی بەخشین ئەوا بەخشی

من دەترسم پاداشتەکانمان لەسەر دونیا بدرێتەوە دەست ....

پاشان دەستی بە گریان کردو سۆزی هەڵسا ئیتر ڕازی لە خواردنەکە هێنا

خۆشـی و بەختـەوەری بـەڵکو هـەزار خۆشـی بـۆ (عبدالرحمـن کـوڕی عـەوف خۆشەویستی خوا لە هەموو ئادەمیزاد ڕاستگۆتر مزگێنی بەهەشتی پێدرا

پاشان کوڕەخاڵی پێغەمبەر ﷺ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص جەنازەکەی بۆ جێگای کۆتایی هەڵگرت

عثمان کوڕی عەففاز – خاوەن روناکی – نوێژی لەسەر کرد

گەورەی بڕوادارن شێری خودا ( عەلی کوڕی ئەبوطالیب ) کفنی کردو ، دەیگوت :-

بەڕاستی گەیشتی بـە چینـی هـەرە بـەرزی بەهەشـتەو ، بـە فێڵـی چوونـە بەهەشـت گەیشتی خوا ڕەحمەت پێ بکات

*　　　*　　　*

# ٦٣

# عومەیری کوڕی سەعد

ئەو یاوەرە بەڕێزەی‌خوای گەورە بە
ڕاستگۆی دەرهێنا و
بۆ پێغەمبەرەکەی بە وەفا بوو ...!!

# {٦٣}

# ﴿ عومەیری کوڕی سەعد ﴾

## ئەو یاوەرەی خـوای گـەورە بە ڕاسـتگـۆی دەرهـێنـاو ، بۆ پێغـــــەمبەرەکەی بە وەفـا بوو .... !!

(عومەیری کوڕی سەعد) هەر لە تەمەنی منداڵی‌یەوە ئازاری بێ‌باوکی و هەژاری چەشت ... باوکی کۆچی دوایی کرد بەبێ ئەوەی ماڵ‌وسامانێکی بۆ بەجێ‌بهێڵێت ...
بەڵام دایکی ئەوەندەی نەبرد شووی بە یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی ئەوس کردەوە ، بە ناوی ( جولاس کوڕی سوەید ) ، عومەیریشی گرتە باوەش و بردیە لای خۆی ...
عومەیر کەوتە ناو چاکەی ( جوڵاس )و چاکی پەروەردەو سێبەری سۆزیەوە وای لێهات ئازاری بێ‌باوکی لەیاد بکات ...
عومەیر ( جوڵاس)ی خۆشدەویست بە خۆشەویستی کوڕ بۆ باوك‌و ، هەروەك ( جوڵاس )یش عومەیری خۆشدەویست بە خۆشەویستی‌یەکی باوکانە بۆ کوڕ ....
سات لە دوای سات ( عومەیر ) گەورە دەبوو‌و گەنج دەبوو (جوڵاس) زیاتر ( عومەیر)ی خۆشدەویست و پـێ‌ی سەرسام دەبوو ، لە کاتێکدا دەیبینی سیفەتی زیرەکی‌و کردەوەی چاك ڕۆژ بە ڕۆژ لە کردەوەکانی بەدیار دەکەوت ، هەروەها سیفەتی دەستپاکی و ڕاستگۆیی لـێ بەدیار دەکەوت لە هەموو هەڵس‌وکەوتێك دا کە پـێ‌ی هەڵدەستا
( عومەیر )ی تازەلاو موسڵمان بوو ، بچووك بوو تەمەنی هێشتا لە دە ساڵان تێپەڕی نەکردبوو ، ئەوەبوو بڕوایی‌یەکی پتەو لە دڵە تەڕو ناسکەکەی لە شوێنێکی بەتاڵ جێگای خۆی گرتبوو ، ئیسلام لە دەروونە پاکۆ بێ‌گەردەکەی‌و خۆڵە بە پیتەکەی لە هەمو شادەمارەکانی بڵاوەی کردبوو ، ( عومەیر ) لەگەڵ ئەوەی منداڵ بوو بە هیچ جۆرێك دوانەدەکەوت لە نوێژ لە دواوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها دایکی هەر کاتێك دەیبینی کوڕەکەی دەچێت بۆ مزگەوت و دەگەڕێتەوە جارێك لەگەڵ باوکی جارێك بەتەنها ئەوا خۆشی دڵ‌ودەروونی دادەپۆشی
(عومەیری کوڕی سەعد) ژیانی بەم جۆرە بردەسەر ، بەبێ ئازارەو بەبێ ئەوەی هیچ ئاڵۆزیەك بەرەنگاری ببێت ، تاکو خوای گەورە حەزی کرد ئەم تازە گەنجە بکەوێتە ژێر تاقیکردنەوەیەك لە هەموو تاقیکردنەوەیەك توندترو ناخۆشتر بێت ....
بە تاقیکردنەوەیەك دا ڕۆیشت کەم گەنج لە ژیانیدا بەم تاقیکردنەوانەدا دەڕۆن ....
لە ساڵی نۆی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری جەنگی ڕۆمەکانی دا لە ( تەبوك)و ، فەرمانی بە موسڵمانان کرد کەوا بچن بۆ ئەم جەنگەو خۆی بۆ ئامادە بکەن

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەیویست بچێت جەنگێك لە جەنگەکان ئاشکرای نەدەکرد وایان بڵاودەکردەوە کە دەچن بۆ شوێنێکی تر بێجگە لەم شوێنانەی کە دەیانەوێت ، تەنها جەنگی ( تەبوك ) نەبێت ئاشکرای کرد لەناو خەڵك ، لەبەر دووری شوێنەکەو ناخۆشی ڕێگاکەو هێزی دوژمن ، بۆ ئەوەی خەڵك کارەکەیان لەبەرچاو بێت و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن وکەرەستەی جەنگی بۆ برەخسێنن ، لەگەڵ ئەمەشدا کەژی هاوین هاتبووە پێشەوە گەرمای بەتینی هێنابوو ، بەروبووم پێگەیشتبوو سێبەر خۆش بووبوو ، مرۆڤ تووشی خاوبوونەوەو تەمبەڵی بووبوو لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشیەش موسڵمانان بەرەو پیری بانگی پێغەمبەرەکەیان هاتن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون و خۆیان بۆ ئامادەکرد ...

بەڵام چینێك لە دووڕووان وایان دەکرد موسڵمانان وورەو توانا بەربدەن و ، گومانیان دەهاوێشتە ناو کارەکانیان و ، لەپاشملە قسەی ناشیرینیان هەڵدبەستا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کۆڕو کۆبوونەوە تایبەتیەکانیان ووشەی وایان دەدرکاند تێکەڵاوی ئاشکرای کوفر دەبوو

ڕۆژێکیان پێش ئەوەی سوپای موسڵمانان بەرێبکەوێت ، ( عومەیر )ی تازەلاو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە پاش ئەوەی نوێژی فەرزی لە مزگەوت بەجێهێناو ، پاش ئەوەی دەروونی پڕببوو بە چەند دیمەنێکی پڕشنگدار لە بەخشین و قوربانی‌یەکانی موسڵمانان کە بە چاوی خۆی بینیبووی و ، بە گوێی خۆی گوێی لێبوو

دەیبینی ئافرەتە موجاهیدە موهاجیرو ئەنصارەکان دێنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە چۆن خشڵ و زێڕەکانیان لە گەردن دەکەنەوەو لە ژێر دەستی دادەنێن بۆ ئەوەی بە نرخەکەی سوپای موجاهیدان لە ڕێگای خوا ئامادە بکەن

• بەهەردوو چاوەکانی خۆی بینی چۆن (عثمان کوڕی عەففان ) بەخۆو بە کیسەیەك هات ئەم کیسەیە هەزار دیناری زێڕی تێدا بوو ، بردیە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ

( عبدالرحمن کوڕی عەوف )ی بینی دووصەد ئۆقیە زێڕی لەسەر ملی‌یەو دەیبات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

هەروەها پیاوێکی بینی ڕایەخی ژێرە خۆی مەزاد کردووەو دەیفرۆشێ بۆ ئەوەی بە پارەکەی شمشێرێك بکرێت شەڕی پێبکات لە پێناوی خوا

بەم جۆرە ( عومەیر ) ئەم دیمەنە سەرسوڕهێنەروجوانانەی دەهێنایەوە پێش چاوی خۆی و ، سەری سوڕما بوو لە بەدواکەوتنی ( جولاس ) بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو گەشتە پیرۆزە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا توانای ماددی هەبوو ، هیچ پاساوێکی نەبوو ، هەروەکو بڵێی ( عومەیر ) دەیویست هانی ( جولاس ) بداو وورەی بەرز بکاتەوەو دەماری پیاوەتی بەئاگا بهێنێتەوە ، بەم جۆرە ( عومەیر ) دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئەم هەواڵ و دیمەنانەی گوێی لێبووبوو ، بە چاوی خۆی بینی بووی بە تایبەتی هەواڵی ئەم بڕوادارانەی کەوا هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، لە کانگای دڵیانەوە داوایان کرد بەرێیان بکات لەگەڵ سوپای موجاهیدان لە پێناوی خوا بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەرێی نەکردن لەبەر ئەوەی هیچ وڵاخێکی نەبوو بۆ ئەوەی بیاننێرێ ، ئینجا گەڕانەوەو چاوەکانیان فرمێسکی خەم و خەفەتیان لێ دەهاتە

خوارەوە چونکە هیواو ئاواتیان بۆ بەجێهێنانی جیهاد نەهاتەدیو بەڕۆشییان بۆ شەهادەت بە ئەنجام نەگەیشت ....

بەڵام ( جۆلاس ) هێشتا بە تەواوی گوێی نەدا بە قسەکانی ( عومەیر ) لەناکاو ووشەیەکی لەدەم دەرچوو عەقڵی ئەم تازە لاوەی لەهۆش خۆ برد

گوێی لێ بوو گوتی :- ( ئەگەر موحەممەد ڕاست بکات لەوەی بانگهێژی بۆ دەکات لە پێغەمبەرایەتی کەواتە ئێمە لە گوێدرێژ کەمترین ) .

( عومەیر ) سەرسام بوو لەمەی گوێی لێبوو ، لەبەر ئەوەی لەم باوەڕە نەبوو پیاوێکی خاوەن ژیری وەکو ( جۆلاس) لەم تەمەنە ، ووشەی بەم جۆرە خراپی لەدەم بێتە دەرەوەو بیخاتە ناو کوفرێك لە فراوانترین دەرگاکانی

هەروەك چۆن ئامێری حاسیبەی ئەلکترۆنی هەڵدەستێت بە ژماردنی ئەو کێشانەی پێشکەشی دەکرێت ، بەم جۆرە بیرو هۆشی (عومەیری کوڕی سەعد) بەکارکەوت بۆ ئەوەی بیر لەم کارە بکاتەوە

ئینجا وای تێڕوانی بێدەنگی لەسەر ( جۆلاس )و چاوپۆشینی ناپاکییە لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی و ، زیان لە ئیسلام دەدا بە تایبەتی ئەو دووڕووانەی فێڵ لە ئیسلام دەکەنو پیلانی پیسی بۆ دەنێنەوە ....

هەروەها پەرت کردنو بڵاوکردنەوەی ئەوەی گوێی لێبوو وەفاداری نییە بۆ ئەم پیاوە کەوا ئەوی لە دەروونی خۆی وەك باوکێك دادەناو ، پاداشت دانەوەی چاکە بە خراپەیەو ، ئەم پیاوە بوو ئەوی گێڕایەوە لە بێباوکیو هەژاری جێگای باوکی بۆ گرتەوە ....

لەسەر ئەم گەنجەش پێویستە یەکێك لەم دوو فەرمانانە هەڵبژێرێت ، هەردووکیان تاڵنو ، دەبێت بە خێراییش هەڵیبژێرێت ....

( عومەیر ) ئاوڕی لە ( جۆلاس ) دایەوەو گووتی :- سوێند بەخوا ئەی ( جۆلاس) یەکێك نییە لەسەر زەوی پاش موحەممەد لە تۆ خۆشترم بووێت .

تۆ نزیکترین کەسی لەمنو ، لە هەموو کەس زیاتر چاکەت بەسەر من هەیە ، قسەیەکت کرد ئەگەر باسی بکەم ڕیسوات دەکاتو ، ئەگەر بیشارمەوە ناپاکیی لەگەڵ ڕاسپاردەکەم دەکەمو خۆمو ئایینەکەم بە فەوتان دەدەم ، ئینجا بڕیارم دا بچمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەواڵی ئەم قسەیەی تۆی بدەمێ ، تۆش ئاگاداری بەوەی کردووتە و گوتووتە

(عومەیری کوڕی سەعد) ڕۆیشت بۆ لای مزگەوت و ، هەواڵی ئەم قسەیەی ( جۆلاسی کوڕی سوەید )ی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ ( عومەیر )ی لەلای خۆی هێشتەوەو ، یەکێك لە یاوەرەکانی نارد بە دوای ( جۆلاس ) بۆ ئەوەی بانگی بکات

زۆری پێ نەچوو ( جۆلاس ) هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سڵاوی لێکردو ، لە نزیکی دانیشت ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

ئەو قسەیە چییە (عومەیری کوڕی سەعد) گوێی لە تۆ بووە ؟!

ئینجا ئەم قسەیەی بۆ کرد

( جۆلاس ) گوتی :-
درۆو قسەم پێهەڵدەبەستێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بەم جۆرە لە دەمی من دەرنەهاتووە
یاوەرەکان چاویان دەگێرا بەسەر ( جۆلاس ) و( عومەیری کوڕی سەعد ) هەروەکو بڵێیت دەیانویست لەسەر لاپەڕەی دەموچاویان بخوێننەوە بزانن چیان لە سینەیان شاردۆتەوە ....
دەستیان بە پسە پس کرد :-
یەکێك لەمانە نیمچە دووڕوویی‌یەکی لە دڵدا بوو ، گوتی :-
گەنجێکی یاخی بوو دەیەوێت خراپە بکات لەگەڵ یەکێك چاکەی لەگەڵ کردووە
هەندێکیان دەیانگوت :-
ئەمە گەنجێکە لە خواپەرستی گەورە بووە ، لە دەموچاوی دیارە قسەی ڕاست دەکات
پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لە ( عومەیر ) دایەوە ، ( عومەیر ) دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو ، فرمێسك بە ڕێژنە لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوەو ، دەکەوتە سەر ڕوومەت و سینگی‌یەوەو دەیگوت :-
پەروەردگارا لەسەر پێغەمبەرەکەت بهێنە خوارەوە و ئەوەی قسەم پێکردووە ، ئاشکرای بکە ...
پەروەردگارا لەسەر پێغەمبەرەکەت بهێنە خوارەوە و ئەوەی قسەم پێکردووە ، ئاشکرای بکە ... ( جۆلاس ) لەسەر چۆك هەڵسایەوەو گوتی :-
ئەوەی من گوتومە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستە ، ئەگەر حەز دەکەیت سوێند دەخۆین ..
من سوێند دەخۆم بەخودا من ئەو قسەیەم نەکردووە کەوا ( عومەیر ) بۆ تۆی گێڕاوەتەوە ....
هێشتا لە سوێندەکەی نەبوو بووە چاوی خەڵك بەسەر ( عومەیری کوڕی سەعد ) دەسووڕایەوە تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانەی نیگای بۆ هاتە خوارەوە ، یاوەرەکان زانیان ئەمە نیگایە ، لە شوێنی خۆیان نەجوڵان و بێدەنگی و ئارامی دەروونی داگرتن و ڕوویان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد
لێرەدا ترس و بیم لەسەر ( جۆلاس ) بەدیارکەوت و ڕووخۆشی و گەشبوونەوە لەسەر ( عومەیر ) بەدیارکەوت بەم جۆرە مانەوە تاکو نیشانەی نیگا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لاکەوت و ، ئایەتی خوای گەورەی بۆ خوێندنەوە :-
﴿ يحلفون بالله ما قالوا ، ولقد قالوا كلمة الكفر ، وكفروا بعد اسلامهم
تاکو ئایەتی خوای گەورە ﴿ فان يتوبوا يك خيرا هم ، وان يتولوا يعذبهم اللّه عذابا أليما ﴾ التوبة ( ٧٤ )
لەگەڵ ئەم ئایەتە گەورەیە (جۆلاس ) لەرز گرتی و ، زمانی گیراو لە فێڵەکانی نا ئومێد بوو ، پاشان ئاوڕی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دایەوەو گوتی :-
(( پاشگەز دەبمەوە ئەی پێغەمبەری خوا بەڵکو پاشگەز دەبمەوە ... ))
( عومەیر ) ڕاستی‌کرد ، منیش درۆم کرد

داوا دەکەم لەخوا ئەم پاشگەز بوونەوەم گیرا بکات و ، منیش بە قوربانت دەبم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لەم گەنجە کرد ( عومەیری کوڕی سەعد ) ، کاتێك فرمێسکی کەیف خۆشی ڕووی تەڕ کردبووەوە بە ڕوناکی پڕشنگداری ئیمان

پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی بۆ گوێچکەی ( عومەیر ) بردو بە نەرمی گرتی و فەرمووی :-

گوێچکەت بە وەفا بوو - ئەی کوڕ - لەوەی گوێت لێبوو ، خواش بە ڕاستگۆی دەرهێنای ....

( جۆلاس ) گەڕایەوە کۆشی ئیسلام و بوو بە موسڵمانێکی چاك

یاوەرەکان زانیان ( جۆلاس ) هەڵسوکەوتی بەرەو چاکی چوو بە هۆی ئەم چاکەیەی هەر کاتێك ( جۆلاس ) ئەمەی بە یاد دەهاتەوە دەیگوت خوا پاداشتی چاکەی ( عومەیر ) بداتەوە ، ڕزگاری کردم لە کوفرو ، ئازادی کردم لە ئاگر ...

*　　　　*　　　　*

ئینجا لێرەدا ئەمە کورتەیەك بوو لە چەند دیمەنێکی پڕشنگداری ژیانی منداڵی ( عومەیر ) ، با ئێستاش کەمێك بوەستین لە چەند دیمەنێکی قەشەنگی تر لە ژیانی گەورەیی ، بۆمان دەردەکەوێت دیمەنی تری لە گەورەیی و پڕشنگداری هیچی وای کەمتر نیە لە ژیانی منداڵی

خەڵکی ( حیمص ) زۆر بێزاربوون لە کاربەدەستەکانیان ، زۆر سکاڵایان بەرز دەکردەوە ، هەر کاربەدەستێکیان بۆ دەهات ئەوا کەموکورتییەکیان لێ دەدۆزییەوە ، گوناهەکانیان کۆدەکردەوەو بەرزیان دەکردەوە بۆ خەلیفەی موسڵمانانو ، داوایان دەکرد بۆیان بگۆڕێت بە یەکێکی چاکتر لەو ...

( ئیمامی عومەر ) بڕیاریدا کاربەدەستێکیان بۆ بنێرێت نەتوانن هیچ کەمو کورتیەکی لێ ببیننەوەو هیچ بێزارییەك لە ژیانی بەدی نەکەن ...

ئەوە بوو جۆرکی پیاوەکانی لەپێشەخۆی داناو ، تیر بە تیر ژماردنی ، بەڵام نەیتوانی لە ( عومەیری کوڕی سەعد ) چاکتر ببینێتەوە ...

لەگەڵ ئەوەی ( عومەیر ) لەم ڕۆژگارەدا خاکی دورگەی عەرەب و وڵاتی شامی دەکوتیەوە لەگەڵ سوپا موجاهیدان جیهادیان دەکرد لە پێناوی خواداو ، شارەکانیان ڕزگار دەکردو قەڵاکانیان دەگرتو ، هۆزەکانیان بۆ ئیسلام مل کەچ دەکرد ، مزگەوتی ماڵی خوایان لە هەموو شوێنێك بنیات دەنا بۆ هەر شوێنێك بیگەیشتبان

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەمیری بڕواداران داوای کردو ، کردی بە فەرمانڕەوا لەسەر ( حیمص ) ئینجا فەرمانی پێکرد ڕوو لەم شوێنە بکات ، بەڵام بەناڵی ئەم ڕێگایەی گرت لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی بە گەورەتر نەدەزانی لە جیهادکردن لە ڕێگای خوادا

( عومەیر ) گەیشتە ( حیمص ) و خەڵکی بانگ کرد بۆ نوێژی بە کۆمەڵ ...

کاتێك نوێژ تەواو بوو وتارێکی بۆ خەڵك دا ، پاش سوپاس و ستایش و سەڵاوەت لێدان لەسەر موحەممەد پاشان فەرمووی :-

(( ئەی خەڵکینە ، ئیسلام قەڵایەکی پۆڵایینەو ، دەرگایەکی پتەوەو ، قەڵای ئیسلام دادەو دەرگای هەقە ... ئەگەر لە قەڵاکە دراو دەرگاکەی شکا ئایینەکە دەست درێژی بۆ دەکرێو سووکایەتی پێدەکرێ ...هەروەها ئیسلام بە پتەوی دەمێنێتەوە تاکو دەسەڵاتی توونْد بێت ... وە توونْدی دەسەڵات بە قامچی وەشاندنو کوشتنی بە شمشێر نیە بەڵکو فەرمان کردنە بە دادوەریو گرتنی ڕێگای هەقە ))

پاشان ڕۆیشت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم پیلانو دەستوورانەی کە لەم وتارە کورتە بۆی باس کردبوون ..

( عومەیری کوڕی سەعد ) ساڵێك بە تەواوی لە ( حیمص ) مایەوە بە بێ ئەوەی نامەیەك بۆ ئەمیری بڕواداران بنێرێتو ، بەبێ ئەوەی درهەمێك یان دینارێك لە دەرامەتی ئەم شارە بۆ ( بیت المال )ی موسڵمانان ڕەوانە بکات ، لەبەر ئەوە گومان لەناو دڵی ( ئیمامی عومەر ) سوڕایەوە زۆر ترسا لەوەی کاربەدەستەکانی تووشی فیتنەی فەرمانڕەوایەتی ببن ، ئینجا بێجگە لە پێغەمبەری خواش ﷺ لە گوناه کردن کەس ( مەعصوم ) نییە ...

بە نووسەرەکەی خۆی گوت :-

بۆ ( عومەیری کوڕی سەعد ) بنووسەو پێی بڵێ :-

ئەگەر نامەی ئەمیری بڕوادارنت بە دەست گەیشت ( حیمص ) بەجێ بهێڵەوەو وەرە بۆ لای ئەمیری بڕوادارانو ، داهاتی ئەم شارە لە دەرامەتی موسڵمانان لەگەڵ خۆت هەڵگرە ...

( عومەیری کوڕی سەعد ) نامەی ئەمیری بڕوادارانی بە دەست گەیشت - خوا لە هەردووکیان ڕازی بێت - جۆرکی خواردەمەنی لەگەڵ خۆی هەڵگرت لەگەڵ قاپی خواردەمەنیو گۆزەی دەست نوێژی خستە سەر شانی خۆیو ڕمەکەی گرت بە دەستەوەو ، ( حیمص ) و فەرمانڕەوایەتی لەپاش خۆی بەجێهێشتو ، دەستی کرد بە ھەنگاو نان - واتە بە پیادە - بۆ شاری مەدینە

هەر کە ( عومەیر ) گەیشتە شاری مەدینە ، بەهۆی ئازارو ناخۆشی ئەم سەفەرە ڕەنگی تێکچوو بووو ، لاشەی لاواز بووبووو مووی درێژ بووبوو .... هەموو شوێنەواری سەفەری پێوە دیار بوو ...

( عومەیر ) لە ئەمیری بڕواداران ( عومەری کوڕی خەتتاب ) چووە ژوورەوە ( ئیمامی عومەر ) سەری سووڕما لەم دیمەنەی ( عومەیر )و گوتی :-

ئەمە چیتە ئەی ( عومەیر ) ؟

ئەویش گوتی :-

هیچم بەسەر نەهاتووە - ئەی ئەمیری بڕوادارن - من ساغو سەلامەتم - الحمدللە - دونیام هەمووی لەگەڵ خۆم هەڵگرتووەو لە قۆچییەوە ڕام کێشاوە.

( ئیمامی عومەر ) گوتی :-

چیت هێناوە لە دونیا ( ئیمام وا گومانی برد ماڵی هەڵگرتووە بۆ - بیت المال - ی موسڵمانان ) ...

ئەویش گوتی :- کیسەکەم لەگەڵە خۆراکم تیا کردووە ...

هەروەها قاپێکم لە لایە تێیدا دەخۆمو جلوبەرگم و سەرمی تیا دەشۆم هەروەها گۆزەیەکم لە لایە ئاوی تیا دەخۆمەوەو دەست نوێژی پێ دەشۆم . ئینجا ئەمەیە هەموو دونیام – ئەی ئەمیری بڕواداران – لەم کەرەستانەم پێک دێت ، لەمە زیاتر نە من پێویستیم پێی هەیە نە خەڵکیش .

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :– ئایا بە پیادە هاتوویت ؟

گوتی :– بەڵێ ئەی ئەمیری بڕواداران .

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :–

ئایا لە فەرمانڕەوایەتی وڵاخێکیان پێ نەدایت سواری بیت ؟

ئەویش گوتی :– ئەوان پێیان نەدامو ، منیش داوام لێیان نەکرد ...

( ئیمام عومەر ) پێی گوت :– هیچت هێناوە بۆ ( بیت المال ) ؟

ئەویش گوتی :– هیچم نەهێناوە ...

( ئیمام عومەر ) گوتی :– بۆچی هیچت نەهێناوە ؟!

ئەویش گوتی :– کاتێك گەیشتمە ( حیمص ) ، ریش سپیو پیاوچاکانی شارەکەم کۆکردەوەو ، ئەوانم کرد بە سەرپەرشتکار بۆ کۆکردنەوەی ئەم دەرامەتە ، هەر کاتێك شتێکیان کۆدەکردەوە ، راوێژم پێدەکردن لە کارەکەو لە شوێنی خۆی دابەشم دەکردو، دەمبەخشییەوە بەسەر پێویستییەکانی ئەم شارە ...

( ئیمامی عومەر ) بە نووسەرەکی گوت :–

جڵەوی فەرمانڕەوایەتی بۆسەر ( حیمص ) بۆ ( عومەیر ) نوێ بکاتەوە ...

( عومەیر ) گوتی :– ئەمە زۆر دوورە ... ئەمە شتێکە نامەوێت ، نە بۆ تۆی دەکەمو نە بۆ پاشەتۆی دەکەم ئەی ئەمیری بڕواداران ...

پاشان ڕێگای پێدا بە ڕۆیشتنی بۆ گوندێك لە دەوروبەری مەدینە خۆیو ماڵومنداڵی تێیدا جێنشین بوون ...

ماوەیەکی زۆری برد لە مانەوەی ( عومەیر ) لە گوندەکەی تاکو ( ئیمامی عومەر ) ویستی هاوڕێکەی تاقی بکاتەوە و ، کارەکەی پتەوتر بکات ، بۆ ئەم کارەش یەکێك لە متمانە پێکراوەکانی خۆی کە ناوی ( حارث ) بوو پێی گوت :–

ئەی ( حارث ) بڕۆ بۆ لای ( عومەیری کوڕی سەعد ) ، لەلای بمێنەوە وەکو میوانێك ، ئەگەر شوێنەواری خۆشیت لێی بینی ، هەروەکو ڕۆیشتیت بۆ لای بەم جۆرە بگەڕێوە ...

بەڵام ئەگەر بینیت باری گرانە ئەم پارانەی بدەرێ ، جۆرێك پارەی دا دەست صەد دینارێتیابوو...

( حارث ) ڕۆیشت تاکو گەیشتە گوندەکەی ( عومەیری کوڕی سەعد ) ، پرسیاری دەربارەی کرد تاکو بینییەوە ...

کاتێك پێی گەیشت گوتی :– السلام علیکم و رحمة الله ...

وەڵامی دایەوەو گوتی :–

وعلیك السلام و رحمة الله و برکاته ، لە کوێ هاتوویت ؟

ئەویش گوتی :– لە مەدینە .

گوتی :– حاڵی موسڵمانان چۆنە ؟

گوتی :- زۆر چاکە .
گوتی :- ئەمیری بڕواداران چۆنە ؟
گوتی :- ساغ و سەلامەتە ...
گوتی :- ئایا سنوورەکانی خوا جێبەجێ دەکات ؟
گوتی :- بەڵێ ... لە کوڕێکی خۆی دا لەبەر ئەوەی ( فاحشە )یەکی کردبوو ، لەگەڵ لێدان مرد ...
( عومەیر ) گوتی :- پەروەردگارا یارمەتی ( عومەر ) بدە ، من ئەوەی دەربارەی دەزانم تۆی خۆش دەوێت ...
حارث بوو بە میوانی ( عومەیری کوڕی سەعد ) بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ، بۆ هەر شەوێك دەستوورکێکی لە نانی جۆ بۆ دەبرد ...
بۆ ڕۆژی سێیەم ، یەکێك لە خەڵکی گوندەکە بە حارثی گوت :-
عومەیرو ماڵەکەت ماندوو کردووە ، هیچ شتێکیان نییە تەنها ئەم دەستوورکە نەبێت کەوا لە دەمی خۆیان گرتۆتەوە ، ماندوویەتی و برسیەتی تینی بۆ هێناون ، ئەگەر تێیدا ڕادەبینی وەرە بۆ لای من و ئەو بەجێبهێڵە ...
لەم کاتەدا حارث پارەکەی دەرهێناو ، دای بە ( عومەیری کوڕی سەعد ) .
عومەیر گوتی :- ئەمە چییە ؟!
حارث گوتی :- ئەمیری بڕواداران بۆی ڕەوانە کردوویت .
ئەویش گوتی :- بۆی بگێڕەوەو ، سەلامی لێبکەو ، پێی بڵێ :-
عومەیر پێویستی بەمە نییە .
خێزانەکەی هاواری لێهەڵساو .... گوێی لەم گفتوگۆیەی نێوان پیاوەکەی و میوانەکەی بوو ... گوتی :-
وەریگرە - ئەی عومەیر - ئەگەر پێویستیت پێی بوو دەیبەخشی ، ئەگەر نا لە شوێنی خۆی دابەشی دەکەی .... پێویست لەم شوێنە زۆرن .
کاتێك ( حارث ) گوێی لەمە بوو ، دینارەکانی فڕێدایە بەردەمی ( عومەیر)و ڕۆیشت ، ( عومەیر ) هەڵیگرتەوەو ، کردیە ناو کیسەیەکی بچووك ئەم شەوە تەواو نەبوو پارەکەی هەموو بەخشی بە هەژاران ، بەشێکی تایبەتی بۆ بنەماڵەی شەهیدەکان دانا (حارث) گەڕایەوە بۆ مەدینەو ( عومەر ) پێی گوت :-
چیت بینی ئەی ( حارث ) ؟
گوتی :- بارێکی گران ئەی ئەمیری بڕواداران .
ئیمام پێی گوت :- دینارەکانت داین ؟
گوتی :- بەڵێ ، ئەی ئەمیری بڕواداران .
ئیمام گوتی :- چی لە پارەکە کرد ؟
گوتی :- نازانم ، گومان دەبەم یەك درهەمی بۆ خۆی نەهێشتۆتەوە .
( ئیمامی عومەر ) بۆ ( عومەیر)ی نووسی و گوتی :-
ئەگەر ئەم نامەیەت بە دەست گەیشت لە دەستت دایمەنێ تا دێی بۆ لای من .

( عومەیری کوڕی سەعد ) ڕووی لە مەدینە کرد ، لە ئەمیری بڕواداران چووە ژوورەوەو ، سلاوی لە ( ئیمامی عومەر ) کرد . ( ئیمامی عومەر ) سلاوی لێکردەوەو بەخێرهاتنی کردو لە نزیك خۆی دانا و پاشان پێی گوت :-

چیت لەم دینارانە کرد ئەی ( عومەیر ) ؟

ئەویش گوتی :- تۆ هەقت چییە پێی پاش ئەوەی بۆ منت ڕەوانە کرد ؟ !!

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :-

سوێندم لەسەرتە بەوەی چیت بەم پارەیە کرد ...

ئەویش گوتی :- کۆم کردەوە بۆ خۆم بۆ ئەوەی سودی لێ‌ببینم بۆ ڕۆژێك ماڵ‌ومنداڵ سوودیان نییە بۆت ...

چاوەکانی ( ئیمامی عومەر) پڕ بوو لە فرمێسك‌و ، گوتی :-

شاهیدی ئەدەم بۆ ئەوەی کەوا لە خۆت گرتۆتەوە لەگەڵ ئەوەی خۆت‌بۆی پێویست بووی ، پاشان فەرمانی کرد بارێك ووشتر لە خۆراك و دوو دەستە جل‌وبەرگ بدەن بە ( عومەیر ) .

( عومەیر ) گوتی :- هەرچی خۆراکەکەیە پێویستیمان پێی نیە ئەی ئەمیری بڕواداران ، دوو ڕوبە جۆم بۆ ماڵەوە بەجێ‌هێشتووە ، هەتا ئەوی دەخۆین خودای گەورە ڕزقێکی ترمان بۆ ڕەوانە دەکات ....

بەلام هەرچی جلەکانە دەیبەمەوە بۆ دایکی منداڵان ، جلەکانی کۆن بووە ئەوەکو لەشی بەدیار بکەوێت ...

ئەم چاوپێکەوتنەی نێوان ( ئیمامی عومەرو عومەیری کوڕی سەعد ) ئەوەندەی نەبرد تاکو خوای گەورە ڕێگای دا بە ( عومەیری کوڕی سەعد ) بگات بە بیلبیلەی چاوەکانی ( موحەممەدی کوڕی عبداللە ) پاش ماوەیەك بوو بۆی بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی بیگاتێ .

( عومەیر ) ڕێگای ئاخیرەتی گرت‌و ماڵئاوایی لە خۆی کردو بە دڵنیاییەوە ، بەبێ ئەوەی بارێکی گران لە دونیای بۆگەن لە خۆی باربکاو دەروونی خۆی پێ ماندوو بکات ... هیچی لەگەڵ خۆی نەبرد بێجگە لە هیدایەت‌و ڕوناکی و لە خوا ترسانەکەی نەبێت ....

کاتێك ( ئیمامی عومەر ) پرسەی کۆچی دوایی هاوڕێکەی پێگەیشت ، خەم‌و خەفەت ڕووی پیرۆزی گرت‌و خەم گمماڕۆی دڵی‌داو گوتی :-

(( حەزم ئەکرد هەندێك مێرخاس‌و کەڵە پیاوی وەکو ( عومەیر )م هەبوایە پشتم پێیان ببەستبا لە کاروباری موسڵمانان )) .

ڕەزای خوا لە ( عومەیری کوڕی سەعد ) بێت .... بەڕاستی قارەمانێکی بێ‌وێنە بوو لە نێو مێرخاسان و ... قوتابیەکی زیرەك‌و بە توانا بوو لە قوتابخانەی ( موحەممەدی کوڕی عبداللە ) ﷺ

*                    *                    *

# ﴿ أم أيمـــــــن ﴾

## بەخێوکـەری پێغەمبەری خوا ﷺ و مژدە پێدراوی بەهەشـت

## {٦٤}

# ﴿ أم أيمن ﴾

## بەخێوكەری پێغەمبەری خوا ﷺ و مژدە پێدراوی بەهەشت

پێغەمبەری خوا ﷺ لە سكی دایكی ئامینەی كچی وەهەب كۆرپە بوو كاتێك باوكی ( عبداللّه ) كۆچیدوایی كرد لە كاتی گەشتی بازرگانی بۆ وڵاتی شام بیلبیلەی چاومان ﷺ كاتێك چاوی گەشی بە دونیا هەڵێنا بێ بەش لە سۆزو لاوانەوەی باوك ، هێشتا تەمەنی پیرۆزی شەش ساڵی تەواو نەكردبوو تاكو دایكی ( ئامینە )ش كۆچی دوایی كرد ، ئیتر منداڵێك بەبێ دایكو باوك مایەوە ...

هەروەها لەم میراتەی لە باوكی ( عبداللّه ) بۆی مایەوە بریتی بوو لە پێنج وشترو ژمارەیەكی كەم لە مەڕو لە جارییەك بە ناوی ( بركة ) ....

( بركـة ) بەخێوكەری پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا بە خزمەتكردنی و چاودێریكردنی و ، چاولێنەبڕینی هەر لە منداڵییەوە ،( بركـة ) سینەیەكی بەسۆزو فراوانی هەبوو لە بەرامبەریو ، بەقسەی خۆشو خۆشەویستییەكی گەورە ، لە ماڵی مامی ( ابو طالب ) گەورە بوو بانگی ( بركة )ی دەكرد بە : ( یا اُمّـه ) واتە ئەی دایكە ئەگەر – خوا لێی ڕازی بێت – لە شوێنی دایكی بوو بۆی لەبەر ئەوە هەڵدەستا بە جێبەجێكردنی كاروبارەكانیو ڕاپەڕاندنی فەرمانەكانی ....

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر كە چاوی پێ دەكەوت كاتی منداڵی بەیاد دەهاتەوە ، ئەو یادگارانەی لەگەڵی بەسەری هاتبوو لە كاتی منداڵی، دەستی بە سۆزەوە لە شانی دەداو دەیگوت :–

(( ئەوە ماوەتەوە لە بنەماڵەم ... )) ..

كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ( خەدیجەی كچی خوەیلد )ی هێنا ، بەخێوكەرەكەی ( بركة )ی ئازاد كرد ئەویش مێردی بە ( عبید كوڕی زەید ) كرد لەم پیاوەش ( ایمن )ی لێ بووو ، بەردەوام هاتوچۆی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرد ، پێغەمبەریش ﷺ هاتوچۆی دەكرد وەكو وەفادارییەك ؛ چونكە بووبوو بە دایكێك لە شوێنی دایكی ، دەچووە لایو هەواڵی لەش ساغی دەپرسیو لەگەڵی دادەنیشتو گفتوگۆی لەگەڵ دەكرد ...

كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە پێغەمبەر بانگهێشتی خەڵكی كرد بۆ سەر ئیسلام ( أم ایمن ) یەكێك بوو لە موسڵمانە پێشەنگەكان بەرەو پیری ئەم بانگەوازە هاتوهاتە

ڕیزی بڕوادارن و موسڵمان بوو ، بەڵام مێردەکەی ( عبید کوڕی زەید ) یاخی بوو و موسڵمان نەبوو ، ئیسلامیش نێوانیانی جیاکردەوە

پێغەمبەری خواش ﷺ بۆ خزمەتکارەکەی خۆی ( زەیدی کوڕی حارثە )ی خواست ، ئەم گەنجە ڕازی نەبوو لەگەڵ باوك و مامی بچێتەوەو ، لای پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵبژاردو بڕیاری دا لەگەڵی بمێنێتەوەو برایەتی ئیمانی بە گەورەتر زانی و نازناوی ئیسلامی پێدرا

( برکة ) لە ( زەید ) سکی بووو ( ئوسامە )ی بوو ، هەردووکیشیان لە مێژووی بانگهێژی بەشیان هەیەو لە جیهادی ڕێگای خواش جێگاو شوێنی تایبەتیان هەیە

وە لە زەماوەندی زەیدو ( برکة ) چەند ڕووداوێکی خۆش هەیە شایەنی ئەوەیە باسی بکەین

هەروەك گوتمان ( امّ ایمن ) دەهاتە مالی پێغەمبەری خوا ﷺ و سەردانی دەکردو هەواڵی دەپرسی و هەڵدەستا بە خزمەت کردنی و قسەی خۆشی لەگەڵ دەکرد ، جارێکیان( زەید ) لە ماڵەوە دەبێت گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت دەفەرمووێت :-

- (( من سَرَّهُ أن يتزوّج امرأةً من أهل الجنّة فليتزوّج ( أم أيمن ) ))

واتە هەرکەسێك حەز دەکات ئافرەتێك لە خەڵکی بەهەشت بهێنێت با ( ام ایمن ) بهێنێت

ئینجا بە خێرایی ئەم ووشەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گوێی زەید کەوت و بووە جێگای قبوڵکردن و ڕازی بوونی لە ناو دڵی ( زەید ) کردەوەو ، ( ام ایمن )ی خواست ....

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ( زەیدی کوڕی حارثە )ی خۆشدەویست تاکو بانگیان دەکرد بە ( زەیدی کوڕی موحەممەد ) ئەگەر فەرمانی خوای گەورە ﴿ ادعوهم لآبائهم ذلك أقسط عندالله ﴾ نەبوایە ئەم ناوەی هەر لەسەر دەمایەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم خۆشەویستی‌یەشی هەبوو بۆ ( ئوسامەی کوڕی زەید ) هەروەك ئەم خۆشەویستی‌یەی بۆ باوکیشی هەبوو ، لەگەڵ ئەوەی( ئوسامە ) پێست ڕەش و لووت پان بوو ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەیفەرموو :-

خوای گەورە تەماشای شێوەتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵتان دەکات ئەم خۆشەویستیەشی بۆ ( زەید ) لە زۆربەی هەڵس‌وکەوتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەو کردار بە دیارکەوت ....

ئەگەر ئەم قسەیە ڕاست بێت هەندێك ناوی خەڵك لە ناوەکانیان بەشیان هەبێت ئەوا ( برکة ) لە ناوەکەی خۆی بەشێکی گەورەی هەیە ...

کۆچ کردنی ( برکة ) – خوا لێی ڕازی بێت – لە نێوان مەککەو مەدینە ئەوەی تووشی بوو لەم گەشتە لە ڕێگای خوا ، باشترین و ئاشکراترین بەڵگەیە لەسەر قسەکانمان ، هەروەك لە کتابی ( طبقات ابن سعد ) هاتووە لە لاپەڕە ( ٢٢٤ ) بەرگی (٨) ئەمەش دەقەکەیەتی :-

– کاتێك ( أم ایمن ) کۆچی کرد شەوی بەسەرداهات لە ( منصَرَف ) پێش ئەوەی بگەنە ( روحاء ) تێنوو بوو ئاوی لەلا نەماو، بەڕۆژوو بوو ، تێنوویەتی تینی بۆ هێنا ، دەولکێك ئاو لە ئاسمان بە پەتێکی سپی بۆی هاتە خوارەوە ، ئاوی تیا خواردەوە تاکو تێر بوو ( أم ایمن ) دەڵێت :-

لە پاش ئەمە تێنووم نەبوو ، دووچاری تێنوویەتی دەبووم بە هۆی بەڕۆژووبوونەوە لە ڕێگا دوورەکان بەڵام پاش ئەم خواردنەوەیە تێنوویەتی کاری لێنەکردم ، وە ڕۆژانی گەرمیش بەڕۆژوو دەبووم هەستم بە تێنوویەتی نەدەکرد ...

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ( أم ایمن ) گفتوگۆی زۆر خۆشی دەکرد ، بەڵام گاڵتەکانی هەمووی ڕاستو دروست بوون ....

( أم ایمن ) پێش کۆچ کردن هاتە لای پێغەمبەری خواو ﷺ گوتی :-

– سوارم بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ... واتە ( سوارێکی ولاخم بۆ پەیدا بکە ) ، ئەویش پێی فەرموو :-

– سواری لەدایك بووی ووشترت دەکەم

( أم ایمن ) گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە توانای منی نیەو نامەوێت ..

( أم ایمن ) وای زانی پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی بچووکی بۆ دەهێنێت بە تەمەن بچووك بێت ، بەڵام خۆی مانای ئەوەیە وشتر ئەگەر بە تەمەنیش بێت ، ئەوا لە دایك بووی وشترە .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

– سوارت ناکەم تەنها سواری لە دایك بووی وشتر نەبێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ گاڵتەی لەگەڵ دەکرد ، لەبەر خۆشەویستی و ڕووخۆشی لەگەڵی

لێرەدا حەز دەکەین چاوێك بخشێنین بە شتێك پەیوەندی هەبێت بە باسەکەمان بە وشەی بەرەکەت کەوا ناوی ئەم ئافرەتە ( برکة ) بووە ، ناوی کوڕەکەشی کە لە ( عبید کوڕی زەید ) بووە ( ایمن ) بووو بەمەش بەناوبانگ بوو ، هەروەها لە نێوان ( البرکة ) و ( الیمن ) ئەمەش لە ماناکەی بە یەکتریان دەبەستێتەوە ، ئەمەش با لە لامان شتێکی غەریب ونامۆ نەبێت هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو :-

هەرکەسێك دەیەوێت ئافرەتێکی خەڵکی بەهەشت بخوازێت با ( أم ایمن ) بخوازێت

( لم ايمن ) – خوا لىٚى رازى بێت – هەندێك جار لە كاتى قسەكردن دا زمانى دەگیرا سەى بە رەحمەت بۆ دەهات ، ماناى وشەكەى تێك دەداو ماناكەى پێچەوانە دەبووە ، بۆ نموونە هەندێك جار لە پێغەمبەرى خوا ﷺ دەچووە ژوورەوەو دەیگوت :–
لا سلام ، یان دەیگوت :– لا سلام علیكم ، پێغەمبەرى خوا ﷺ رێگاى پىٚدابوو ت :– السّلام ... ئەمە بۆ ئەو بەس بوو ...
هەروەك لە جەنگى ( حونەین ) رووىدا هەڵسایەوەو بە موسڵمانانى گوت :–
– ثبّت اللّٰه أقدامكم ...
– پێغەمبەرى خوا ﷺ پىٚى فەرموو :–
– ئەى دایكە بىٚدەنگ بە ، تۆ زمانت گرانە
( لم ایمن ) – خوا لىٚى رازى بێت – لە زۆربەى جەنگەكان بەشدارى ىرد ، ماندووبوون و پاداشتى لە خواى گەورە داوا دەكرد ، كارى لەم جەنگانە ە بوو هەڵدەستا بە ئاودانى موجاهیدە تینووەكان و ، تیماركردنى بریندارەكان و ردێرى كردنیان .
بەشدارى جەنگى ( ئوحدو خەیبەرو حونەین )ى كرد ، پێغەمبەرى خوا ﷺ دێك پارەى پىٚدەبەخشى ، لە برى ئەوەى ماندوو دەبوو و بەشدارى جیهادى دەكرد پێغەمبەرى خوا ﷺ نەخۆش كەوت ( لم ایمن ) دەچووە لاى و دڵى دەدایەوەو بەدزى ەوە فرمێسكى بۆ هەڵدەرشت ..
كاتێك پێغەمبەرى خۆشەویست ﷺ گیانى پاكى سپارد بە پەروەردگارى جیهانیان ایمن ) زۆر بە پەرۆشەوە گریاو ، هەناسەى حەسرەتى بۆ هەڵدەكێشا ، پىٚیان وت ، ئایا دەگریێت ؟؟
( لێرەدا پرسیارى موسڵمانان جێگاى سەرسورمان نىیە ، بەڵكو پرسیارى سڵمانان ئەوەیە بروایان بە قەزاو قەدەر هەیەو دەشگریێن ؟! )
( لم ایمن ) – خوا لىٚى رازى بێت – وەڵامى دەدانەوەو دەیگوت :–
بەڵى سوێند بە خوا زانیم پێغەمبەرى خوا ﷺ هەر كۆچى دوایى دەكات ، بەڵام من نیكا دەگریم كەوا وەستا لەگەڵمان لە ئاسمان ..
هەروەك دەزانین هۆى گریانیش جیاوازە لە نێو خەڵكیدا بە گوێرەى پەیوەندى مایەتى و هاتووچۆ كەوابە یەكیان دەبەستێتەوە ، ( لم ایمن ) بە هۆى كۆچى دوایى ەمبەرى خۆشەویستمان ﷺ كورێك و گەورەیەك و پێغەمبەرێكى لە دەست دا
كورێك بە دەستى خۆى بەخێوى دەكردو چاودێرى دەكردو بووبوو بە ورە لێپرسراوى ، لێپرسراوێك سنوورى ژیان و كاروبارى رۆژانەى بۆ نەخشە ێشاو ، پێغەمبەرێك هیدایەتىدا بۆ رێگاى ئیسلام ، رێگاكانى ژیانى بۆ روناك ەوەو ، رزگارى كرد لە ژیانى بەندایەتى و ، واباسى دەكرد كەوا خەڵكى بەهەشتە ...

لە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانی نزیك بووەوە بگات بە بە پەروەردگار ، ئاڵای موسڵمانانی دا دەست ( ئوسامەی کوڕی زەید ) لە سوپایەك دا گەورە یاوەرەکان تێیدا بەشداربوون ، خۆیان ئامادە دەکرد بۆ ڕۆیشتن بۆ کەنارەکانی شام لە کاتێك لەمەوپێش لە جەنگی ( مۆتە ) لەم شوێنەدا پیاوەکەی ( زەیدی کوڕی حارثە ) تێیدا شەهید بووبوو لەگەڵ ( عبداللّەی کوڕی ڕەواحە و جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب ) -خوا لێیان ڕازی بێت-.

هەندێك لە خەڵك تێبینییان کرد بە وەڵام دانەوە لە سەرکردایەتی ( ئوسامە ) لە کاتێکدا لە تەمەنێکی بچووك سەرکردایەتی گەورە پیاوانی موسڵمانانی دەکرد ، لە ناویاندا پیاوی سەربازی ترو سەرکردەتر هەبوون هونەریان لەم کارەدا بە گوێرەی تێڕوانینی خۆیان ، هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا زۆر نەخۆش بووو ، ئەویش فەرمووی :-

سوێند بەخوا ( ئوسامە ) شایەنی ئیمارەتەو هەروەك باوکیشی شایەن بوو ...

خەڵکەکە هەر هەمووی بێ دەنگ بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی کۆتایی بۆ کردن

( أم ایمن ) چاوی گەشایەوەو دڵی شادمان بوو بەوەی کوڕەکەی ( ئوسامە ) سەرکردایەتی سوپای موسڵمانان دەکات بۆ شامو تۆڵەی باوکی شەهیدو مێردی خۆشەویستی دەکاتەوە

بەم جۆرە سوپای ( ئوسامە ) هەر لە مەدینە بوو لە ڕۆژانی نەخۆشی و کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بەڕێ بکەوێت ، کاتێك ( ئیمامی ئەبوبەکر ) – خوا لێی ڕازی بێت – بوو بە خەلیفەی پێغەمبەر و ئاڵای لە ئوسامە نەسەندەوەو ماڵ ئاوایی لە سوپا کرد تاکو زۆر دوورکەوتەوە لە شاری مەدینە

( ئیمامی ئەبوبەکر ) بە پیادە دەڕۆیشت و ( ئوسامە ) بە سواری ، ( ئوسامە ) هەوڵیدا لەبەر گەورەیی ئەو دابەزێ و خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوار ببێ و ئەویش لەگەڵی بڕوا . ( ئیمامی ئەبوبەکر ) گوتی :-

سوێند بەخوا نایەتە خوارەوە ، چی تیایە بۆ من ئەگەر کاتژمێرێك لە پێناوی خوادا پێیەکانم تۆزاوی بێت

( ئوسامە ) بە نیازی خۆی هەڵسا بە ڕاپەڕاندنی کارەکەی کەوا پێی سپێردرابوو بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە ، ( أم ایمن ) بە چاوی فرمێسکاوییەوە ، فرمێسکی خۆشی پێشوازی لێکردو ، دڵی پڕ بوو لە سۆزو خۆشەویستی بۆ خوداو ، سوپاسی خوای گەورەی کرد بۆ ئەم گەورەیی‌یەی پێی بەخشی ، لەم شوێنەدا یادگاری کوڕە شەهیدەکەی لە جەنگی حونەین ( ایمن )ی بەیاد هاتەوە ، لەم دونیایەدا جگە لە ( ئوسامە ) کەسی تری نەمابوو

لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ( أم ایمن ) پلەو پایەکی بەرزی هەبوو لەلای خەلیفەکانی ( ئەبوبەکرو عومەر ) چونکە ئەوان دەیانزانی ئەم ئافرەتە چ پلەو

پایەکی هەبوو لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەوە ڕێزیان دەگرت و بەرزیان دەکردەوە ...

ئەویش – خوا لێی ڕازی بێت – هەستی بەم ڕێزو پلەیە دەکردو ڕێزی ئەوانی دەگرت ...

کاتێك ( ئیمامی عومەر ) شەهید کرا ( ام ایمن ) دەگریا و دەیگوت :-

– ئەمڕۆکە ئیسلام بێ هێز بوو ...

( ام ایمن ) تەمەنی درێژ بوو زۆر بەساڵا چوو .... کاتێك ( ئیمامی عثمان ) جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست ، نەخۆشیەکی زۆر توندی توش بوو ، پاشان گیانی پاکی بە پەروەردگار سپاردو/ بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە کوڕو مێردە خۆشەویستەکەی گەیشت ...

وا دەگێڕنەوە ( ابن ابی الفرات ) ناکۆکی هەبوو لەگەڵ ( حسن کوڕی ئوسامەی کوڕی زەید ) لە زەمانی خەلافەتی ( عومەری کوڕی عبدالعزیز ) – خوا لێی ڕازی بێت – ( ابن ابی الفرات ) بە نەوەی ( ام ایمن ) ( حسن )ی گوت :-

ئەی کوڕی ( برکة ) !!!

مەبەستی لەم قسەیە ( ام ایمن )ی داپیرەی بوو ، هەروەکو بڵێیت خزمەتکاری بەندە بوو ..

( حسن ) بە ئامادەبووانی گوت :- بە شاهید بن .

پاشان سکاڵای بۆ ( ئەبوبەکر کوڕی حزم ) بەرزکردەوە کەوا قازی مەدینە بوو ، چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە ، ( ئەبوبەکر کوڕی حەزم ) بە ( ابن ابی الفرات )ی گوت :-

مەبەستت چی بوو لە وتەی :- ئەی کوڕی ( البرکة ) .

( ابن ابی الفرات ) گوتی :- بە ناوی خۆی بانگم کرد ....

قازییەکە گوتی :-

بەڵکو مەبەستت بچوك کردنەوەی بووو ، پلەشی لەناو ئیسلام دیارە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە ئەی دایکە یان ( ام ایمن ) ، خوا ڕزگارم نەکات ئەگەر ڕزگارت بکەم ، پاشان جەڵتا قامچی لەم پیاوەدا .

خوای گەورە ڕازی بێت لە بەخێوکەری پێغەمبەری خوا ﷺ ... دایکی لە شوێنی دایکی و ، دایکی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ( ئوسامەی کوڕی زەید ) و ... ، دایکی شەهید ( ایمن ) و خێزانی شەهید ( زەیدی کوڕی حارثە ) ، خوای گەورە لە لای خۆی پلەوپایەی بەرز بکات .

* * *

## ٦٥

# ﴿ نوعەیمی کوڕی مەسعود ﴾

## یاوەرەیَك بوو بە ڕاستی زانی جەنگ فرتوفێڵە

# ﴿ نوعەیمی کوڕی مەسعود ﴾
# یاوەرێك بوو . بە ڕاستی زانی جەنگ فرتو فێڵە

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) گەنجێکی چاوکراوەو ژیرو چالاك بوو ، سەردەریێو بەردەرێو بە تەواوی لێك جیادەکردەوە ، هیچ گرێیەکی لێ ئالۆز نەدەبوو بە هیچ کێشەیەکیش پەکی نەدەکەوت ، پیاوی بیابانییان پێدەگوت ، خودای گەورە زانستی مەزەندەو خێرا لە فێڵ گەیشتن و بیرتیژی پێ بەخشیبوو

بەلام لەگەڵ ئەمەشدا لە کاتی جاهیلیدا پیاوێکی ئارەزوو بازو هاوڕێی خۆشی و ڕابواردن بوو ، هەموو ڕابواردنو ئارەزووەکانی لە لای جولەکەکانی ( یەثریب ) دەبردە سەر ئەم پیاوە هەر کاتێك ئارەزووی هەڵسابا بۆ گۆرانی بێژێکی ئافرەت یان گوێی لە نزمی مۆسیقایەك بوایە ئەوا لە شوێنی خۆی کەوا ( نجد ) بوو باڵی دەگرتو بۆی دەردەچوو ، ڕووی لە مەدینە دەکرد لە کاتێك ماڵی بە سەخاوەتی دەڕێشتە سەر جوولەکەکانو ئەوانیش بە سەخاوەتی ئارەزووە شەیتانییەکانی خۆیان کەموکورتیان بۆی نەدەکرد

ئینجا لێرەدا ( نوعەیم ) زۆر هاتوچۆی ( یەثریب )ی دەکردو ، پەیوەندییەکی بەهێزی هەبوو لەگەڵ جولەکەکانی ئەم شوێنە بە تایبەتی جولەکەی ( بنی قریظە ) کاتێك خودای بەخشندە مرۆڤی گەورە کرد بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرەکەی ئایینێکی ڕاستو هەقو ، دۆڵو بیابانی مەککە ڕوناك بووەوە بە روناکی ئیسلام ، بەلام ( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) هەتا ئەو کاتە لە زەلکاوی ئارەزووەکانی خۆی دەخولایەوە

تا شەوێك لە شەوان ( نوعەیم ) بە مەی خواردنەوە خەریك بوو تا سەرخۆش بوو دەروونی خۆی تێر دەکرد بە گوێگرتن لە گۆرانی بێژە ئافرەتەکانو سەمای ئافرەتان .... لە کاتێکدا عەرەقەکە یاری دەکرد لەگەڵ عەقڵیو هۆشی لەخۆی نەما ، وشەیەکی لەدەم دەرچوو ئینجا ئەگەر بە ئەنجامەکەی بزانیایە دەری نەدەکرد بەڵکو لە سینگی خۆی دەیشاردەوەو نەیدەدرکاند کۆمەڵەکەی هەواڵی کاروانەکانی قوڕەیشییان ئاشکرا کرد کە پڕ بوو لە کەلوپەل بەنرخ لە ڕێگای شام بە ڕێگای عێراق

ئەم قسەیە لە ڕێگای پیاوێکی موسڵمان کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ کردبووی بە هەواڵگری بۆ گەیاندنی هەواڵەکان گواسترایەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەری خواش ﷺ پۆلێکی لە یاوەرەکانی خۆی بە سەرکردایەتی ( زەیدی کوڕی حارثە ) نارد بۆ ئەوەی ڕێگا لە کاروانەکە بگرێت کەوا لە شام دەگەڕایەوە

بەم جۆرە ( نوعەیم کوڕی مەسعود ) لەسەر ئەم بێبڕوایی وکوفرو عینادە مایەوەو ، گاڵتەی بە موسڵمانان دەکردو ، قینی لێهەڵدەگرتن ، لەبەر ئەوەی شوێنێکی

بەرزی هەبوو لە نێو هۆزی ( غیطفان ) کەوا بە بەهێزترین و گەورەترین هۆز دەژمێردرا لەناو هۆزەکانی ( نەجد ) ....

هەروەها ( نوعەیم ) گەورەترین دژایەتی ئەم ئایینەی دەکردو ، لەوە دەترسا ئەم خۆشی و ڕابواردنەی لەکیس بچێت

پاشان ئەوەندەی نەبرد خۆی بینیەوە لە نێو دوژمنە گەورەکانی ئیسلامو ، شمشێری بەرز کردەوە بەرامبەر بە موسڵمانان

بەڵام ( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) لاپەڕەیەکی سپی نوێی لە دەروونی خۆی کردەوە لە مێژووی بانگهێژی ئیسلام دا لە ڕۆژی جەنگی ئەحزاب ...

لێرەدا لەم شوێنەدا جوانترین و گرنگترین چیرۆك لە چیرۆکەکانی فرتو فێڵی جەنگ دەگەیێنین بە گوێچکەی موسڵمانان ...

چیرۆکێك تاکو ئێستا مێژوو بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە بە چەند زنجیرەیەکی پتەو قارەمانی داستانەکە دەگێڕێتەوە

ئینجا بۆ ئەوەی بچینە ناو ناوەڕۆکی داستانەکەی ( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) پێویستە کەمێك بۆ دواوە بگەڕێینەوە

پێش جەنگی ئەحزاب ( خەندەق ) بە کەمێك ، چینێك لە جولەکەکانی ( بەنی قریظە )ی مەدینە ( یثریب ) دەرچوون بۆ شوێنەکانی دەوری مەدینەو دەرەوەی مەدینە ، گەورەکانی خۆیان نارد بۆ ئەوەی خەڵکان کۆبکەنەوە بۆ جەنگی پێغەمبەری خوا ﷺ و لەناوبردنی ئایینەکەی ....

چوونە لای قورەیشەکانی مەککەو ، هانیان دان بۆ جەنگ کردن لەگەڵ موسڵمانانو پەیمانیان پێدان بێن بەیەك لە کاتی گەیشتنیان بۆ شاری مەدینەو پاشان ساتێکی دیاری کراو ( سەعات سفر ) دابنێنەوە بۆ لێدانیان لە یەك ساتدا

پاشان ئەوانیان بەجێهێشت ڕوویان کردە هۆزی ( غیطفان ) لە ( نەجد ) هانیان دان دژی ئیسلامو پێغەمبەرەکەی ، بانگیان کردن بۆ ئەوەی ڕەگو ڕیشەی ئەم ئایینە نوێیە لە ڕەگەوە هەڵتەکێنن ، ئینجا ئەو نهێنییانەی لەگەڵ قورەیشیان بەست لەگەڵ ئەوانیشیان بەست ، ئەو پەیمانەی لەگەڵ قورەیشیان دا لەگەڵ ئەوانیشیان دا ، هەروەها بەم مەوعیدەی دایان نا لەگەڵیان ڕێکەوتن ...

قورەیشەکان لە مەککە دەرچوون بە گەورەو بچووکو پیادەو سوارەوە بە فەرماندەی ( ئەبو سوفیان کوڕی حەرب )و ، ڕوویان لە مەدینە کرد ...

هەروەها ( غیطفان ) دەرچوون لە ( نەجد ) بە هەموو هێزو کەرەستەی جەنگیەوە بە سەرکردایەتی ( عویەینەی کوڕی غەطفانی)

هەروەها لە پێشەنگی پیاوەکانە ( غطفان ) قارەمانی داستانەکەمان ( نوعەیمی کوڕی مەسعود )ی لەگەڵ بوو ....

کاتێك هەواڵی ئەم سوپا گەورەیە گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ یاوەرەکانی خۆی هەمووی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکردن لەم کارەدا ، ئەوانیش وا بڕیاریان دا کەوا خەندەقێك هەڵبکەنن لە دەورەی مەدینە بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئەم پەلامارە گەورەیە

بینەوەو ئەم لافاوە بگرن کەوا توانای بەرنگاربوونەوەیان نەبوو ، هەروەها بۆ ئەوەی ئەم خەندەقە رێگا لەم لافاوەو سوپا زۆرە هێرش بەرە بگرێت ...

ئەم دوو سوپایەی مەککەو نەجد کەوا نزیک دەبوونەوە لە ناوچەکانی نزیک شاری مەدینە هێشتا نەگەیشتبوونە شاری مەدینە ، تاکو گەورەکانی جولەکەی ( بەنی النضیر ) چوونە لای جولەکەی ( بەنی قریظە ) کەوا جێنشین بوون لە مەدینە ، هانیان دان بچنە ناو جەنگی پێغەمبەرو ، یارمەتی ئەم دوو سوپایە بدەن کەوا لە مەککەو نەجد بەرەو ڕوویان دێن

گەورەکانی ( بەنی قریظە ) پێیان گوتن !

ئێمەتان بانگ کرد بۆ کارێك نە حەزی پێدەکەین و نە مەبەستمانە ، هەروەها ئێوە دەزانن لە نێوان ئێمەو موحەممەد پەیمانێك هەیە لەسەر ئەوەی ئاشتی بنوێنین هەردوولا لە مەدینە بە ئاشتی و ئاسایش و دڵنیایی بژین ، وە ئێوە دەزانن هێشتا مەرەکەبی پەیمانی ئێمە لەگەڵ ئەوان وشك نەبۆتەوە ...

ئێمە دەترسین لەوەی ئەگەر موحەممەد لەم جەنگە سەرکەوتنی بەدەست هێنا لێمان بدات بە تۆڵەیەکی وا لە ڕەگەوە لە مەدینە هەڵمان بکێشێت لە سزای ئەم تاوانە ...

بەڵام گەورەکانی ( بەنی نظیر ) بەردەوام بۆیان دەڕازاندنەوەو بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و ستەم لە موحەممەد بکەن ، دڵنیایان دەکردنەوە بەوەی کەوا ئەم کارەساتە ئەم جارە گومانی تیا نییە لەسەر موحەممەد دەسوڕێتەوە ...

ورەیان بەرز دەکردنەوە بە هاتنی ئەو سوپا گەورەیە ، ئەوەندەی نەبرد جولەکەکانی ( بەنی قریظە ) بە گوێیان کردن و ئەو پەیمانەی بەست بوویان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیان وەشاندەوە .

ئەم لاپەڕەی نێوان خۆیان و ئەوانیان دڕاندو ... ئیعلانیان کرد پاڵ بدەن بەم دوو لەشکرە واتە قورەیش و نەجد ..

ئەم هەواڵە وەکو بروسك لێدان گەیشتە موسڵمانان ..

دوو سوپاکە دەورەی شاری مەدینەیان گرت و خواردن و خواردەمەنییان لە خەڵکەکە قەدەغە کرد ...

پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کەوتۆتە نێو دەمی دوژمنەوە ...

قورەیش و غطفان سەربازگەیان دانا بەرامبەر موسڵمانان لە دەرەوەی مەدینە و ( بەنی قریظە )ش لە ناوەوەی شاری مەدینە لە پشتەوەی موسڵمانان چاوەڕێیان دەکردو خۆیان ئامادە کردبوو .....

پاشان دووڕووەکان ئەوانەی لە دڵیان نەخۆشی هەبوو ئەو شتانەی شاردبوویانەوە لە دەروونیان ئاشکرایان کردو دەیانگوت :-

موحەممەد بەڵێنمان دەداتێ بە گرتنی گەنجینەی کیسراو قەیسەر ، وا ئەمڕۆش ئێمە هیچ کەسێکمان لە خودی خۆی ئەمین نیە تاکو بچێت بۆ سەر ئاویش !!

پاشان دەستیان پێکرد کۆمەڵ لە دوای کۆمەڵ پێغەمبەریان بەجێدەهێشت بە پاساوی ترس لەسەر ژنەکانیان و منداڵەکانیان و ماڵەوەیان لە هێرشی ( بەنی قریظە )

دەیانخستە سەریان ئەگەر جەنگ ڕووی بدابایە ، تاکو وای لێهات بێجگە لە چەند سەدێك لە بڕوادارە ڕاستگۆیەکان کەسێ تری لەگەڵ نەمایەوە

تاکو شەوێك لە شەوەکانی ئەم گەمارۆیەی کەوا نزیکەی بیست ڕۆژی خایاند بوو پێغەمبەری خوا ﷺ هانای برد بۆ پەروەرگار ، دوعای پێویستی لێکرد تاکو چەند جار ئەم دوعایەی دووبارە دەکردەوە :-

پەروەردگارا من داوای سەرکەوتنت لێ دەکەم کەوا پەیمانو بەڵێنت پێداوم ...

پەروەردگارا من داوای سەرکەوتنت لێ دەکەم کەوا پەیمانو بەڵێنت پێداوم ...

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) لەم شەوەدا خۆی وەردەگێرا لەسەر جێگاکەی و خەو لە چاوی نەدەکەوت هەروەکو بڵێیت بزماری لە چاو کوترابێ و نەیدەتوانی چاوی پێکەوە بنێت ، چاوەکانی بە ئەستێرە گەشتیارەکان دەگێڕا لەم ئاسمانە صافو بێگەردە بیری دوورو درێژی دەکردەوە .... لەناکاو خۆی وا بینیەوەو پرسیاری لەخۆکرد :-

خاکت بەسەر ئەی نوعەیم !!

چی تۆی هێناوە لەم شوێنە دوورە لە نەجد بۆ ئەوەی جەنگ لەگەڵ ئەم پیاوەو ئەوانەی لەگەڵیدان بکەیت ؟ !!

تۆ جەنگ ناکەیت لە پێناوی وەرگرتنەوەی مافێکی زەوت کراو یان دەمارگیرییەك بۆ سەندنەوەی تۆڵەی ناموسێك ، بەڵکو هاتوویت جەنگ بکەیت و بکوژیت یان جەنگ بکەیت بەبێ هۆ ؟ !!

خاکت بەسەر ئەی نوعەیم !!

چی وای لێکردوویت شمشێر هەڵبکێشیت بەرامبەر ئەم پیاوە چاکە کەوا فەرمان بە شوێن کەوتووانی دەکات بە دادوەری و یەکسانی و بەخشین بە خزمان ؟!!

چی وای لێکردوویت ڕم بە خوێن بکەیت بە خوێنی یاوەرەکانی کەوا بە دوای ئەوە کەوتوون کە بۆیان هاتووە لە هیدایەت و هەق ؟!!

هێشتا ئەم گفتوگۆ توونده لە نێوان ( نوعەیم ) و دەروونی تەواو نەبوو بوو تاکو بڕیارەکی یەکجارەکی لەم ساتەدا لە دەروونی ( نوعەیم ) دەرچوو بۆ ڕاپەڕاندنی

بەم جۆرە ( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) لە سەربازگەی هۆزەکەی لە ژێر تاریکایی شەو خۆی دزییەوە ، دەستی کرد بە هەنگاو هاوێشتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وەستاوە لە بەرامبەری فەرمووی :-

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) ؟!

گوتی :- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ...

فەرمووی :- چی وای لە تۆ کردووە لەم کاتو ساتە بێی بۆ ئێرە ؟!!

گوتی :- هاتووم بۆ ئەوەی شایەدی بدەم هیچ خوایەك نییە جگە لە ( اللّه ) و ، تۆ بەندەی خواو پێغەمبەری خوایت ، وە ئەوەی هێناوتە ڕاستە ....

پاشان بەردەوام بووو لەم قسانە :-

من موسڵمان بووم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، میللەتەکەم بە موسڵمان بوونیمنیان نەزانیووە ...

فەرمانم پێبکە ، بەوەی حەزی لێدەکەیت ...

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

تۆ بە ڕاستی لەناو ئێمە تەنها پیاوێکیت ، بڕۆوە ناو میللەتەکەت ئەوەندەی دەتوانی پەرتەوازەیان پێبکە ، بەڕاستی جەنگ فرتو فێڵە ...

ئەویش گوتی :- بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

ان شاء الله ئەوەی دەیبینی پێت خۆش دەبێت ...

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) یەکسەر ڕۆیشتە ناو ( بەنی قریظە ) - کەوا پێشتر هاوڕێیەتیو برادەرایەتی هەبوو لەگەڵیان ...

پێی گوتن :-

ئەی ( بەنی قریظة ) ، ئێوە دەزانن من ئێوەم خۆش دەوێتو ئامۆژگاری ڕاستتان دەکەم ...

گوتیان :- بەڵێ ، تۆ لە لای ئێمە جێگای گومان نیت ...

( نوعەیم ) - خوا لێی ڕازی بێت - گوتی :-

قوڕەیش و غیطفان لەم جەنگەدا لە حاڵێکن وەکو حاڵی ئێوە نین ...

گوتیان :- ئەمە چۆن ؟!

( نوعەیم ) گوتی :-

ئەم وڵاتە وڵاتی خۆتانە ، ماڵو منداڵو ئافرەتی ئێوەی لە ناوەو ناتوانن بەجێی بهێڵن بۆ شوێنێکی تر ....

بەڵام قورەیش غەطفان ماڵو منداڵو ئافرەتیان لەم وڵاتە نییە

ئەوانە هاتوون بۆ جەنگی موحەممەدو ، داواتان لێکرا پەیمانیان هەڵوەشاندەوەو یارمەتیان دان ...

ئەگەر ئەمانە سەرکەوتن بەدەست بهێنن لەم جەنگە قازانج دەکەن ، وە ئەگەر سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لەبن بڕکردنیان بە ساغو سەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتیان ، بە جێتان دەهێڵن ، تۆڵەتان لێدەسێنرێتەوە بە خراپترین تۆڵە ...

ئێوە دەزانن ئەگەر ئەوان بڕۆن توانای ئەمانەتان نییە ....

گوتیان :- ڕاستت گوت ، تۆ چ بیروڕایەکت لە لایە ؟ !

( نوعەیم ) گوتی :-

بیروڕای من ئەوەیە بەشداری شەڕیان لەگەڵ نەکەن تاکو چینێک لە گەورە پیاوەکانیان نەهێڵنن بۆتان و بیانکەن بە ڕەهن لەلای خۆتان بەم جۆرە دەتوانن شەڕی موحەممەدیان پێ بکەن لەگەڵ خۆتان تاکو سەرکەوتن بەدەست دەهێنن یاخود کۆتا پیاو لە ئێوەو ئەوان دەمێنێت ....

جولەکەکان گوتیان :-

ڕێگات پێ نیشان داینو ، ڕاستت گوت ....

پاشان ڕۆیشت لە لایانو چووە لای ( ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب ) فەرماندەی قورەیش بەم و بەوانەی لەگەڵی بوون گوت :-

ئەی کۆمەڵی قورەیش ، ئێوە دەزانن من چەند دلسۆزم بۆ ئێوەو دوژمنداری موحەممەد دەکەم ....

من هەواڵێکم پێگەیشتووە وام پێچاك بوو بۆتانی ئاشکرا بکەم ، ئامۆژگاریتان دەکەم بیشارنەوەو ، بڵاوی نەکەنەوە ....
گوتیان :-
ئەوەی بە ئێمەت گوت جێبەجێی دەکەین ...
( نوعەیم ) گوتی :-
( بەنی قریظە ) پەشیمان بوونەتەوە لە دوژمنداری کردنی موحەممەدو ، بۆ موحەممەدیان ڕەوانە کردووەو دەڵێن :-
ئێمە پەشیمان بووینەوە لەوەی کردوومانە .... بڕیارمان داوە بگەڕێینەوە بۆ پەیمانەکەت و ئاشت بوونەوەت
ئایا ڕەزامەندیت هەیە پیاوێکی زۆر لە گەورە پیاوانی قورەیش و غیطفان بهێنین و تەسلیم بە تۆی بکەین بۆ ئەوەی لە ملیان بدەیت ....
پاشان پاڵ بدەینە تۆ بۆ جەنگ کردن لەگەڵیان تاکو لەناویان دەبەین ...
بۆیان ڕەوانە کردو گوتیان :- بەڵێ
ئەگەر جولەکەکان بۆیان ڕەوانە کردن و داوای ڕەهنیان لێکردن لە پیاوەکانتان یەك کەسیان نەدەنێ
ئەبو سوفیان گوتی :-
تۆ باشترین پشتیوانیت ... پاداشتی خێرت داوە
پاشان ( نوعەیم ) لە لای ( ئەبو سوفیان ) ڕۆیشت ، چوو بۆ لای هۆزەکەی غیطفان ، چی لەلای ئەبو سوفیان گوت ئەمەشی لەلای ئەوان گوت ، ئاگاداری کردنەوە لەوەی ئەوانی پێ ئاگادار کردبووەوە ...
( ئەبو سوفیان ) ویستی ( بەنی قریظە ) تاقی بکاتەوە کوڕەکەی خۆی بۆ ڕەوانە کردن و پێی گوتن :-
باوکم سڵاوتان لێدەکا و پێتان دەڵێت :-
ئەو گەمارۆیەی سەر موحەممەدو هاوەڵەکانی درێژەی کێشا تاکو تووشی مەلەل و دڵەڕاوکێ بووین ....
ئێمە بڕیارمان داوە لەسەر ئەوەی جەنگ لەگەڵ موحەممەد بکەین و دەست بەرداری بین ....
باوکم منی ڕەوانە کردووە بۆتان بۆ ئەوەی بەیانی جەنگیان لەگەڵ بکەین
پێیان گوت :-
ئەمڕۆ ڕۆژی شەممەیە ، ئێمە هیچ کارێکی تیا ناکەین و پاشان ئێمە بەشداری جەنگ لەگەڵ ئێوە ناکەین تا ( حەفتا ) کەس لە پیاوە گەورەکانی ئێوەو پیاوە گەورەکانی (غیطفان ) نەکەن بە ڕەهن لە لای ئێمە ....
ئێمە دەترسین لەوەی شەڕ گەرم بێت لەسەرتان بە خێرایی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتتان و لەگەڵ موحەممەد بە تەنها بەجێمان بهێڵن ...
ئێوە دەزانن ئێمە توانای ئەوانمان نی یە

کاتێك ( کوڕی ئەبو سوفیان ) گەڕایەوە ناو میللەتەکەی و هەواڵی دانی بەوەی گوێی لێبوو لە ( بەنی قریظه ) هەموویان بە یەك دەنگ گوتیان :-

ڕیسوا بێت نەوەی مەیمون و بەراز ...

سوێند بەخوا ئەگەر داوای یەك مەڕ

بکەن نایاندەینێ ....

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) خوا لێی ڕازی بێت -سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە تێکدانی ڕیزەکانی دوژمن و یەك بیروڕایان ....

خودای گەورە ڕەشەبایەکی توندی ڕەوانەی سەر قورەیش و هاوپەیمانەکانی کرد ، بەم جۆرە خیوەتەکانیان لە سنگەوە هەڵتەکاو ، مەنجەڵەکانیان کە خواردنی تیابوو هەڵگەڕایەوە و ئاگرەکانیان کوژایەوە و لەناو تۆزو خۆڵ ون بوون و ، وایان لێهات یەکتریان نەدەناسییەوە ...

بۆیە هیچ چاریان نەما تەنها کۆچکردن نەبێت ... ئەوە بوو لە تاریکیای شەودا کۆچیان کرد

کاتێك موسڵمانان بەیانیان کردەوە بینییان دوژمنانی خوا پشتیان هەڵکردووەو ، هەموویان هاواریان کردو گوتیان :-

الحمد لله الّذي نصر عبده ...

و اعزّ جنده ....

و هزم الاحزاب وحده

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) پاش ئەم ڕۆژە بە جێگای بڕوایی پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە ، کاروباری پێدەسپاردو ئاڵای جیهادی پێ هەڵدەگرت ...

ڕۆژی فەتحی مەککە لە کاتێکدا ( ئەبو سوفیان کوڕی حەرب ) وەستا بوو تەماشای سوپای موسڵمانای دەکرد ... بینی پیاوێك ئاڵای غەطفانی هەڵگرتبوو ، بەوانەی کە لەگەڵ خۆی بوون گوت :- ئەمە کێیە ؟!

گوتیان :- ( نوعەیمی کوڕی مەسعود )ە ....

( ئەبو سوفیان ) گوتی :- ئەمە خراپترین شتی پێکردین ڕۆژی خەندەق ....

سوێند بەخوا لە هەموو کەس زیاتر ئەوە دوژمنداری موحەممەدی دەکرد

وە ئا ئەوە ئاڵای هۆزەکەی هەڵگرتووە لە بەرامبەری ....

لەژێر ئاڵاکەی شەڕمان لەگەڵ دەکات ....

( نوعەیمی کوڕی مەسعود ) - خوا لێی ڕازی بێت - وەکو سەربازێکی کۆڵنەدەر لە ڕێگای خودا مایەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ڕازی بوو و ، بەشداری هەموو جەنگەکانی دەکرد ، تاکو ڕۆژی ( صیفین ) پاڵیدا لەشکری ( ئیمامی عەلی ) - خوا لێی ڕازی بێت - جەنگی کردو دژی چینی باغیەکان تاکو شەهید بوو ... - خوا لێی ڕازی بێت -

* * *

٦٦

# زەیـــدی کوڕی ثابــت

## زاناو موفتـــی و موجاهیـــدو یەکەم کۆکەرەوەی قورئان

# ﴿ زەیدی کوڕی ثابت ﴾
## زانـــاو مـوفتـیو موجاهــیدو یەکـــەم کۆکــــەرەوەی قـــورئان

ئەگەر قورئانەکەت گرت بە دەستی ڕاستەوەو ، ڕووت لە قیبلە کردو ، چوویتە ناو باخچە فراوانـەکانی قورئـان ، سـوڕەت بـە سـوڕەتو ئایـەت بـە ئایـەت ، دەبێـت ئـەوە بزانیـت قـەرزاری یـەکێکیت بـە چاکـەو سـوپاس لەسـەر ئـەم کـردەوە مەزنـەی ئـەنجامیدا ، ئێسـتا کـەمێك دەوەسـتین لەگـەڵ قارەمـانێك لـە قارەمانـەکانی ئیسلامو ، یاوەرێك لە یاوەرە بەرێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، یەکێك لە زاناکان کەوا بە نهێنی لە پەروەردگار دەترساو ، یەکێك لە قازیی‌یە لەخوا ترسەکان ، کەوا دەترسا لە سنوورەکانی خواو ، زۆر بیری دەکردەوە پێش ئەوەی فەرمان دەربکات ، وە یەکێك لە موجاهیدەکـان کـەوا زۆر بـە پـەرۆش بـوو بـۆیو پێشـبڕکێی دەکـرد لـە مـەیدانی جـەنگ دا ، لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەش گـەورە بـوو بـە کۆکردنـەوەی قورئـانو ، بـوو بـە نووسەری نیگای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەروەها بوو بە وەرگێڕێکی زمانەوانی کەوا لەم کاتەدا وەرگێڕ زۆر کەم بوو ، زمانی جولەکە فێر بوو بوو بۆ ئەوەی موسڵمانان لە فێڵەکانیان ئەمین بن ، لە خراپەکانیان دوور بن ...

ئەم یاوەرە بەرێزەش ( زەیدی کوڕی ثابتە ) - خوا لـێی ڕازی بێت -

باس کردنـی ئـەم کەسـایەتیە بێ‌وێنەیـە دەمـان گوازێتـەوە بـۆ کـەشو هەوایـەکی فێنكو بۆندارو زۆر لایەنی جیاواز ...

ئەوەیە پێشەوای گەنجانی مسوڵمان

ئەوەیە پێشەوای زانا کارکردووەکان بە زانستەکانیان ...

ئەوەیە پێشەوای موجاهیدە قارەمانەکان ...

ئەوەیە پێشەوای هەموو ئەوانەی خۆیان دەهاوێنە داوی فەتوادان ...

ئینجـا لـێرەدا دەتوانـین سـیفەتی دەسـتپاکیو ڕاسـپاردەیی لـە قارەمـانی ئـەم داستانەمان ( زەیدی کوڕی ثابت ) - خوا لـێی ڕازی بێت - ببینینـەوە ، پاشـان ئاشـنا دەبین بە کردەوەیەك بە تەنها لەنێو یاوەرەکان لە ژیـانی ئەم یـاوەرە دیـار بوو ئـەویش زانستی میرات بوو .

هەروەك ( ئەنەسی کوڕی مالیك ) - خوا لـێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە و دەڵێت :-

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت :-

بەزەیی‌ترین کەس لە ئومەتم بە ئومەتم ( ئەبوبەکر)ە ، لە هـەموویان توندتر لەسـەر ئاینی خوا ( عومەر)ەو ، لە هەموویان بەشەرم ترو ئابڕووتر ( عثمان )ە و ، لە هـەموویان زانـاتر لە زانستی میرات ( زەیدی کوڕی ثـابت )و ، لـە هـەموویان شارەزاتر لـە حـەڵالو حەرام ( موعاذ کوڕی جەبەل )ەو ، هەر ئومەتێك دڵسۆزێکی هەیەو دڵسۆزی ئەم ئومەتە ( ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح )ە

ئەم یاوەرە بەرێزە ناوی ( زەیدی کوڕی ثابت کوڕی ضّحاك کوڕی زەید کوڕی لوذان کوڕی عەمرو کوڕی عبد عوف کوڕی غنم کوڕی مالك کوڕی نجاری ئەنصاری خەزرەجی‌یە ) .... نازناوی ( باوکی سەعد)ە پێیان دەگوت ( باوکی خارجە ) .

دایکی ناوی نوار کچی مالك کوڕی معاویە کوڕی عدی کوڕی عامر کوڕی غنم کوڕی عدی کوڕی نجارە .

ئەم یاوەرە بەرێزە لە شاری مەدینە گەورە بووو ، بە ڕوناکی ئیسلام گەورە بوو تیشکی دایەوە لە کوچەکانی مەدینە ، هیدایەت دانی بەستڕایەوە بە دڵی کەس‌وکارەکەی لە خێرایی دا

ئەوکاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی پیرۆزی گەیشتە مەدینە ، تەمەنی ( زەید ) یازدە ساڵان بوو ، ئەم منداڵە بچووکەش لەگەڵ کەس‌وکارە موسڵمانەکەی موسڵمان بووو ، پیرۆز بوو بە دوعاکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیان ...

هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ جێنشین بوو لە مەدینە تاکو پایەکانی ئیسلام بەهێز بووو ، ڕووکنەکانی ئیسلام بڵاوبووە لە نێو خەڵك ...

هەروەها دروست کردنی مزگەوتیش یەکەم قاعیدەی ڕوحی و فێربوون بوو مسوڵمانە بەرێزو پیاوچاك‌و پاکەکان تێیدا دەرچوون

ئینجا لەم کەش‌وهەوا جوانەدا قارەمانی بەرێزمان ( زەیدی کوڕی ثابت ) – خوا لێی ڕازی بێت – پەروەردە بوو ....

باوکی ڕۆژی ( بعاث ) پێش ساڵی کۆچی کوژرا ، بەم جۆرە زەید بەبێ باوك مایەوە ...

( زەیدی کوڕی ثابت ) – خوا لێی ڕازی بێت – لە پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین باوك‌و ، چاکترین مامۆستاو ، مەزنترین پێشەواو ، گەورەترین مرۆڤی دۆزیەوە ... خوای گەورەش ڕاستی فەرمووە کە دەفەرموێت :–

﴿ النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم ﴾

ئینجا ژیان لە مەدینە لەم ڕۆژگارەدا نەیاندەزانی پشوودان‌و پاڵدانەوە مانای چی‌یە ، ژیانێکی پڕ لە بەرەکەت‌و جوڵانەوەو چالاکی و کارکردنی بەردەوام

( زەید ) هەر لە تەمەنی ( دە ) ساڵان کەوا موسڵمان بوو ئیسلام وەکو خوێن گەڕا بەناو عەقڵ‌و هەموو ئەندامەکانی لەشی ، بیروهۆشی بە قورئانی پیرۆز کرایەوە هێشتا هەر منداڵ بوو ... بەم جۆرە هەر لە منداڵی‌یەوە ( زەید ) پێشبڕکێی لە ئیسلام کرد نەیدەزانی دەرچوون بۆ ڕێگای یاخی‌بوون مانای چی‌یە ...

( زەید ) لەم کاتەی گەیشت بە پێغەمبەری خوا ﷺ خستی‌یە ناو قوتابخانەکەی ، بوو بە مامۆستای‌و خۆراکی دا بە هیدایەتی‌و ، بەم جۆرە ( زەیدی کوڕی ثابت ) یەکەم پێگەیشتنی خۆی و پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت :–

(( منیان برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ، گوتیان :–

(( پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم منداڵە لە ( بەنی نجارە ) حەڤدە سورەتی لەم قورئانەی بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە لەبەر کردووە ، بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ خوێندەوە سەرسام بوون پێی‌و ، پێی گوتم :–

(( ئەی زەید ، نووسینی جولەکەم بۆ فێرببە ، من سوێند بەخوا ئەمین نابم لێیان لەسەر نووسینەکانم )) .

( زەید ) دەڵێت :– فێری بووم ، پاش ئەوەی شەش مانگی نەبرد بە تەواوی لێی شارەزا بووم ، بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ دەنووسی ئەگەر بۆی بنوسیبوان

بەم جۆرە قارەمانی خۆشەویستمان هەڵسا بە فێربوونی زمانی جولەکە بە هۆی ئەم فەرمانەی لە لای پێغەمبەر ﷺ دەرچوو ... لەگەڵ ئەوەی فێربوونی زمانی جولەکە ئەوەندە ئاسان نییە ، جولەکەش زۆر ڕەزیلییان دەکرد بەوەی عەرەب هیچ شتێکیان لێ فێر بن ، لەگەڵ ئەمەش شەش مانگی نەبرد ( زەید ) توانی زمانیان فێر ببێت ...

دەبێت لێرەدا بزانین هۆی فەرمان کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە فێربوونی زمانی جولەکە چیبوو ، لەم کاتەی بۆ یەکەم جار پێی نایە ناو خاکی مەدینەو کردی بە پایتەختی دەوڵەتەکەی ....

لای هەمووان ڕوون‌وئاشکرایە جولەکە لەم کاتەوە تا ئێستا چ ( سیطرە )کیان هەیە لەسەر سیاسەتی جیهان دا ، ئینجا بە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی خوای گەورە بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار کرایەوە لە فێڵ‌و تەڵەکەی جولەکەکان و چۆنیەتی خۆپاراستن لێیان ، ئینجا لێرەدا بە کورتی باسی جولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەکەین بۆ ئەوەی بزانین ( زەید ) بە فێربوونی ئەم زمانە چ خزمەتێکی ئیسلامی کردووە .

جولەکە لەناوەوەو دەرەوەی شاری مەدینە هەبوون لە گەڕەکێکی تایبەتی دا نیشتەجێ بووبوون ، ئەوەی جولەکە براکانیان لە ( بەنی نضیر )و ( بەنی قریظە ) بەدەریان خستن لە شوێنەکانی خۆیان لە دەرەوەی مەدینە ....

جولەکەی (بەنی نضیر ) خانووەکانیان لە بڵندایی بوو لە دۆڵی ( بەطحان ) لە دووری دوو یان سێ میل لە شاری مەدینە کەوا ئاوەدان کرابووەوە بە کشتوکاڵ‌و بە دارخورما ...

جولەکەی ( بەنی قریظە ) لە ناوچەی ( مهزور ) لە باشووری مەدینە بە چەند میلێك جێنشین بووبوون . هەرچی جولەکەکانی ( خەیبەر ) بوون لە دووری هەشت بورد لە مەدینە بەلای شام دا جێنشین بووبوون ، جولەکەی ( خەیبەر ) بە دەوڵەمەندی‌و بە پیتی خاکیان‌و زۆری باغ‌و کشتوکاڵ بەناوبانگ بوون ، هەروەك ئەوەی بەناوبانگ بوون بە قەڵای گەورەو عاسێ ...

لە نزیك ئەوانیش بەشێکی تر لە جولەکە جێنشین بوون وەکو جولەکەی ( وادی القری ) و ( تیماء ) و ( فدك ) ... هەموو کاتێك خانووەکانی جولەکە بە پتەوی‌و بە بەهێزی دروست دەکرا بۆ ئەوەی لە کاتی مەترسیدا خۆیانی تیا حەشار بدەن وبەرگری لە خۆیان بکەن لە پشتەوەی هەورەك قورئان ئاماژەیان بۆ دەکاو دەفەرموێت :–

﴿ لا يقاتلونكم جميعاً الا في قرى محصّنةٍ أو من وراء جُدُر ﴾

هەروەها شوێنەکانیان لە جێگای زەوی بە پیت هەڵدەبژاردو ڕێگای هاتووچۆی بازرگانی دەریایی‌و وشکایی بوو لە دوورگەی عەرەب

جولەکەکان بە هەموو هێزێکیان هەوڵیان دەدا ناویان دیار بێت لە نێو عەرەب دا پێش ئیسلامو دوای پەیدابونی ئیسلام ... ئینجا لێرەدا هەڵدەستن بە بازرگانی خورماو گەنمو جۆ ، کەوا لەم کاتەدا گرنگترین بەرووبوومی کشتوکاڵی بوون ... کەوا پێویستی بنچینەیی خەڵکی دورگەی عەرەب بوو ، هەروەها دانیشتوانی گوندەکان کاری سەرەکیان بریتی بوو لە بەخێوکردنی چوارپێ و باڵندەو لەگەڵ ڕاوکردنی ماسی .

هەروەها جولەکەکانی دورگەی عەرەب بەناوبانگ بوون بە زێڕینگری ، بە تایبەتی جولەکەی ( بەنو قینقاع ) جگە لەمەش بەناوبانگ بوون بە پیشەسازی و شمشێرو قەڵغانو هەموو کەرەستە جەنگییەکان

ئافرەتەکانیان بە پیشەسازی ڕستنو چنین خۆیان خەریك دەکرد کەوا مەوادە سەرەتاییەکانیان لە مەڕومالآت وەردەگرت .

پیاوەکانیان کاریان دەکرد لە پیشەسازی زێڕو حەریر .

ئینجا گرنگی دانی جولەکە لە زێڕو پیشەسازی جەنگی هۆیەکی دیارەو بەرهەمەکی لە کەس شاراوە نییە ، لەبەر ئەوەی هەموو بیرکردنەوەیەکی جولەکە لەم کارانەدا ئەوەبوو زاڵ بێت بەسەر هۆیەکانی کارکردن و بە مەبەستی مل کەچ کردنی میللەتەکانی تر بۆ سیاسەتەکانیان ، کەوا ئەم سیاسەتەش تەنها خزمەتی خۆیان دەکات ...

هەروەها زۆربەی کڕینو فرۆشتنەکانیان لەگەڵ میللەتانی تر لەسەر بنچینەی موراهەنەو سوو خواردن بوو ، لەبەر ئەوەی ئەم کارەشیان شیاو بوو بۆ ئەم مەبەستە ؛ چونکە پیشەی زۆربەی ناوچەکانی مەدینە لەسەر کشتوکاڵ بوو ، لەبەر ئەوە جوتیارەکان قەرزیان وەردەگرت تا کاتی بەرهەم هێنانو دوورنە کردن ....

لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کرد جولەکە توانی کۆنترۆڵی بازاڕەکان بکات بە هۆی هێزی ئەم داراییەی هەیان بوو کەوا کۆیان دەکردەوە بە جۆرەها ڕێگەی شاردنەوەی خۆراكو سوو خواردنو ڕێگەی ناشەرعی ، ئەمانەش وای کردبوو ببنە جێگای ڕق لێبوونەوەی خەڵكو و عەرەبەکان ...

بەڵام پێغەمبەری سەرورمان ﷺ بێئاگا نەبوو لەم پیلانانەی جولەکە لە شاردنەوەو سوو خواردن و .... هتد .

سوڕەتو ئایەتێکی زۆری بۆ هاتە خوارەوە تێیدا فرتوفێڵەکانی جولەکەی بۆ ئاشکرا کرد پێغەمبەرمان ﷺ زۆر دووربین بوو لە کارەکەی کاتێك فەرمانی کرد بە قارەمانی خۆشەویستمان ( زەیدی کوڕی ثابت ) بۆ ئەوەی فێری زمانیان ببێت .

ئەم کارەش لەگەڵ جولەکە کۆتایی هات بەمانەی خوارەوە :-

بەڕیشە هەڵکێشانی جولەکەی ( بەنی قینقاع ) و ( بەنی نضیر ) لە شاری مەدینە هەروەك هەرچی جولەکەی ( بەنی قریظە ) بوو تووشیان بە تووشی سزایەکی توندتر بوو هەروەك لە پەرتووکەکانی ( سیرە ) بۆمان باس دەکات .

ئینجا بابێینەوە سەر قارەمانی داستانەکەمان (زەیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری ) با یەکەم جار لە ڕۆڵی جیهادی ڕێگای خوا دەست پێبکەین :-

خزمو نزیکەکانی هۆزەکەی لە جەنگی ( بەدر ) بەشداریان کرد بەڵام ( زەید )یان گەڕاندەوە لەبەر بچووکی تەمەنی

لە جەنگی – ئوحد – ( زەید ) لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوشانەکانی چوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوایان لێکرد لە شوێنێك لە ڕیزەکانی موجاهیدان دایان بنێت .

پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوێکی سوپاسەوە گەیشت بە موجاهیدە منداڵەکان ، بەڵام داوای لێبووردنی کرد ، بە ڕەوانە کردنیان بۆ جەنگ ..

( رافع کوڕی خەدیج ) هاتە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕمێکی هەڵگرتبوو بە بلیمەتانە دەیهێناو دەیبرد ، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت :-

(( هەروەکو دەمبینی ڕم هاوێژم ، لێزانم لە هاوێشتن ڕێگام پێبدە )) ..

پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندییەوە ڕێگای پێدا

پاشان ( سَمرة کوڕی جوندب ) هاتە پێشەوەو ، بە ئەدەبێکی جوانەوە ماسولکەکانی خۆی نیشان داو ، هەندێك لە کەس وکارەکەی بە پێغەمبەریان ﷺ گوت :-

( سەمورە ، رافع بە زەویدا دەدا )

دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنەیەکی سۆزەوە ڕێگای بە ئەویش دا

شەش کەس لەناو تەمەنەکانی خۆی مانەوە لەوانە ( زەیدو عبداللەی کوڕی عومەر ) ی لەناو دابوو . دووبارە بە تکاکردن و پاڕانەوە چوونەوە بۆ لای و فرمێسکیان هەڵدەڕشت و ماسولکەی خۆیان نیشان دەدا ... بەڵام تەمەنیان هێشتا بچووك بووو لەشیان تازەوشل بوو ، پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی پێدان بەشداریان پێبکات لە جەنگێکی تر ...

لە جەنگی خەندەق ( احزاب ) ( زەید ) بەشداری کرد و خۆڵی هەڵدەگرت و دەیگواستەوە بە دڵسۆزی ...

پێغەمبەری خوا ﷺ ( زەید)ی بەم جۆرە بینی زیاتر ڕێزی لێناو ، شەهادەیەکی بەرزی تری پێبەخشی

هەروەك کوڕی ( عبدالبّر ) دەگێڕێتەوە :- ( زەیدی کوڕی ثابت ) خۆڵی لەگەڵ موسڵمانان دەگواستەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەرهەقی فەرموو :-

(( أمَا إنّه نِعـْمَ الغُلام )) واتە :- ئەمە بەڕاستی باشترین کوڕە ...

ئەم ڕووداوەش دەیسەلمێنی ( زەید ) زۆر ماندوو بووە ، بە هۆی ئەم ئارەقەی هەڵیدەڕشت لە جەنگی خەندەق .

( واقدی ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت :-

{( زەید ) لەگەڵ ئەو موسڵمانانە دابوو خۆڵیان دەگواستەوە خەوی دەبردەوە ،( عمارەی کوڕی حەزم ) هات بۆ لای چەکەکەی برد بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

ئەی باوکی ( رقاد ) واتە ئەی باوکی نووستوو ... لەم ڕۆژەوە پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کرد بە شیواندن و تەنگاوکردنی بروادار، نە بەڕاستو نە بە گاڵتە دەست نەدرێتە کەرەستەی بروادار ...}

لە جەنگی تەبوك پێغەمبەری خوا ﷺ ئاڵای لەدەست ( عمارەی کوڕی حەزم ) سەندەوە دایە دەست ( زەیدی کوڕی ثابت )، ( عمارە ) گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکت دەربارەی من پێگەیشتووە ...؟

ئەویش فەرمووی :- ئەخێر بەڵام قورئان پێش دەکەوێت زەید ) قورئانی زیاتر لەتۆ لەبەرە لێرەدا شتێکی گرنگ ئاگادارمان دەکاتەوە

قورئان لە سینەی موسڵمان تەنها بۆ خوێندنەوە ناپارێزرێ بەڵکو بۆ خوێندنەوەو کـار پێکردنیـەتی و ـ جیـهادکردن بـۆ بەرزکردنـەوەی ئـایینی خـواو پاراستنی ڕێبازەکەیەتی

( زەیدی کوڕی ثابت ) بەشداری جەنگی ( یەرموك )ی کرد دەورێکی گرنگی گێڕا لە دابەش کردنـی غەنیمەتـەکان ، ئەمـەش نیشـانەی ئـەوەبوو ( زەیـد )ی بـە بڕوادارێکـی ئەمین و دەستپاك دادەنرا بۆیە ئەم کارەیان پێسپارد

بەڵام نیشانەی دەستپاکی و دڵسۆزی ( زەید ) تەنها لـەم کارە بەدیار نەکەوت بەڵکو کرابوو بە نووسەری نیگای پێغەمبەریش ﷺ

هەر کە نیگا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە خوارەوە دەیفەرموو :-

بانگی ( زەید )م بـۆ بکـەن بـە خـۆی و بـە شـانە ئێسـك و مەرەکەبەکـەی بـۆ ئـەوەی بینووسێت بەم جۆرە ( زەید ) خاوەنی شەهادەیەکی ترە ئەویش ( نووسەری نیگا )

کاتێك جەنگی هەڵگەڕاوەکان دەستی پێکرد ژمارەیەکی زۆر لەوانەی قورئانیان لەبەر بوو شەهید بوون ، ئینجا بە فەرمانی یەکەم ( عومـەری کوڕی خـەتتاب )- خوا لـێی ڕازی بێت - کۆکردنـەوەی قورئـان ئامـاژەی بـۆ کـرا جێبـەجێکردنی ئـەم فەرمانـە بـە خـێرایی لـە لایـەن ( ئەبوبـەکری صدیـق ) - خـوا لـێی ڕازی بێـت - یەکـەم خەلیفـەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێکرا

ئەوەبوو ( ئیمامی عومـەر ) - خـوا لـێی ڕازی بێـت - بـە ( هەروەلـە ) هـات بـۆ لای ( ئیمامی ئەبوبەکر )و پێی گوت :-

{ ئـەی خەلیفـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ کوژراوزۆر بووەو بـە قورئـان خوێنـەکان دا هـاتووە لـە جەنگی یەمامە ، من دەترسم کوشتن بە قورئـان خوێنـەکان دابێت و زۆربەی قورئان خوێنەکان بڕۆن ، من وا تەماشا دەکەم فەرمان بکەیت بە کۆکردنەوەی قورئان }

( ئیمـامی ئەبوبـەکر ) هیچ چارەیـەکی نـەما جگـە لـە بـانگ کردنـی ڕاوێژکارەکـانی و دەسـتە ڕاستی ( ئیمـامی عومـەر ) نـەبێت ئەمـەش بـۆ ڕەزامـەندی خـواو سـوور بـوون لەسـەر پاراسـتنی کتـابی خـوا ... فـەرمانی بـە ( زەیـدی کـوڕی ثـابت ) کـرد بـە کۆکردنەوەی قورئان ...

( زەیـدی کوڕی ثـابت ) دەگێڕێتـەوە - خـوا لـێی ڕازی بێـت - ( ئیمـامی ئەبوبـەکر ) پێی گوتم :-

{ تۆ گـەنجێکی ژیری و جێگـای بڕوایی ، تۆ بووی نیگـای پێغەمبـەری خـوات ﷺ دەنووسییەوە ، بڕۆ بە دوای قورئان و کۆی بکەرەوە .. } .

گوتم :- {چۆن کارێك بکەم پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە }.

گوتی :- سوێند بەخوا ئەمە چاکەیە .

( ئیمامی ئەبوبەکر ) هێشتا نەهاتبووە لام ، تاکو خوای گـەورە سینگی جـۆش دام هەروەك سینگی ( ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عومەر)ی جۆش دا ، بەدوای قورئان گـەڕام لە پێست و شانە ئێسك و سینگی پیـاوان کۆم کردەوە . بەم جۆرە بڕواداری دڵسـۆزمان هەڵسا بەم کارە گرنگەو پشتی بەخوا بەست تاکو ئەم قورئانەش گەیشت بە ئێمە

هەروەك ( ذهبي ) لە پەرتووكی ( اعلام النبلاء ) دەڵێت :-

لە گەورەیی (زەید ) :- ئیمامی ئەبوبەكر پشتی پێ دەبەست لە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز لە لاپەڕەكاندا ، كۆی كردەوە لە شانە ئێسكو پێست .

ئەم لاپەڕانە بۆ ماوەیەك لە لای ( ئیمامی ئەبوبەكر ) پارێزرا ، پاشان درا بە ( ئیمامی عومەر ) .

پاشان لە لای دایكی بڕوادران ( حفصه ) بوو ، پاشان درا بە ( زەیدی كوڕی ثابت ) و چەند كەسێك لە قوڕەیش ئیتر ئەم قورئانە ناسرا بە ( مصحف العثماني ) لەبەر ئەوەی بە سەرپەرشتی ( ئیمامی عثمان ) كرا - خوا لێی ڕازی بێت - ئێستا ملیۆنەها دانەی لێ چاپ كراوە لەسەر ڕووی زەوی .

هەروەها ( زەیدی كوڕی ثابت ) شارەزاییەكی تەواوی هەبوو لە زانستی ( فرائض ) واتە : دابەشكردنی میرات ، كەوا بە شارەزاترین یاوەر دەژمێردرێت لەم زانستەدا لەم سەردەمەدا

هەروەك ( زهری ) دەڵێت :-

(( ئەگەر ( زەید ) - فرائض - ی نەنووسیبوایە وام دەبینی خەڵك لە بیریان دەكرد )) .

هەروەها ( الشعبی ) دەڵێت :-

( زەید ) لە خەڵك گەورەتر بوو بە دوو شت :- ( فرائض )و ( قورئان )

دووبارە ( زهری ) دەڵێت :-

(( ئەگەر ( ئیمامی عثمانو زەید ) كۆچی دواییان بكردایە لە هەندێك كاتدا ( زانستی فرائض ) نەدەما ، زەمانێك بەسەر خەڵكدا هات جگە لەوان كەسی تر نەیدەزانی )) .

فتوادان لە هەموو كاتێك پێویستی بە لەخواترسان و دەستپاكیو شارەزایی لە ئایین و زۆر شتی تر هەیە ، لەبەر ئەوە ئەم كارە بە خەڵكانێكی تایبەتیو زۆر كەم دەكرێت ...

یاوەری بەرێزمان ( زەیدی كوڕی ثابت ) یەكێك بوو لەمانەی لەسەردەمی دەوڵەتی ئیسلام دا فتوای دەدا ... بەم جۆرە گەیشتە پلەی موفتییەكان لە یاوەرەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم یاوەرانەش ئەوانە بوون :-

(( ئیمامی عومەرو ، ئیمامی عەلیو ، ئیبن مەسعودو ، زەیدی كوڕی ثابتو ، ئەبی و ئەبو موسا )) بوون ...

ئەم ڕۆژەی ( زەیدی كوڕی ثابت ) كۆچی دوایی كرد ( سالم ) دەڵێت ، گوتم :-

( ئیمڕۆ زانای خەڵك كۆچی دوایی كرد .... ) .

عبدالله كوڕی عومەر- خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت :-

(( خوا ڕەحم بە ( زەید ) بكات ، زانای خەڵك بوو لە خەلافەتی ( ئیمامی عومەر )و زاناكانی ڕەوانەی شاران كرد و قەدەغەی كردبوون فەتوا بە بیروڕای خۆیان بدەن ، ( زەیدی كوڕی ثابت )ی لە مەدینە وەكو بڵێی زیندان كردبوو فەتوای بۆ خەڵك دەدا )) .

هەروەها ( زەیدی كوڕی ثابت ) وەكو قازییەك بوو فەرمانی بە خەڵك دەدا ، ( الشعبی ) دەڵێت :-

قازی‌یەکان چوار کەس بوون :- ( ئیمامی عومەرو ، ئیمامی عەلی‌و ، زەیدو ، ئیبن مەسعود )

( زەید ) یەکێك بوو لەم زانایانەی لە زانستی ئایین چووبووە خوارەوەو ، هەروەك ( ئیبن عباس ) - خوا لێی ڕازی بێت - دەفەرموێت

( قورئان لەبەرەکان لە یاوەرەکانی موحەممەد ﷺ بە ڕاستی دەیانزانی ( زەیدی کوڕی ثابت ) لە زانست چوویتە خوارەوە

( ئەبی سلمە ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت :-

( ئیبن عباس ) بۆ ( زەیدی کوڕی ثابت ) هەڵپسایەوە ، جڵەوی وڵاخەکەی بۆ گرت

( زەید ) - خوا لێی ڕازی بێت - پێی گوت :-

{ واز بێنە ئەی کوڕی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ }

(ئیبن عباس ) - خوا لێی ڕازی بێت - پێی گوت :-

{ ئێمە بەم جۆرە ڕێز لە زاناو گەورەی خۆمان دەگرین }

( مالك ) دەگێڕێتەوە دەڵێت :-

{ ئیمامی خەڵك پاش ( ئیمامی عومەر ) ، ( زەیدی کوڕی ثابت ) بوو ، هەروەها پاش ( زەید ) ئیمامی خەڵك ( عبداللەی کوڕی عومەر ) بوو - خوا لە هەمووان ڕازی بێت - }

ئەگەر قارەمانی خۆشەویستمان ئەو هەموو سیفەتە جوان‌و مەزنانەی هەبێت ، جێگای خۆیەتی ئەمیری بڕواداران ( عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێی ڕازی بێت - لە جێگای خۆی دایبنێت هەر کاتێك سەفەری حەج یان شامی کردبا

مێژوو نووسەکان بیروڕای جیاوازیان هەیە لە کۆچی دوایی ئەم یاوەرە مەزنە ( زەیدی کوڕی ثابت ) - خوا لێی ڕازی بێت -

(واقدی ) دەڵێت :-

ساڵی ( چل‌وپێنجی ) کۆچی کۆچی دوایی کردووە ، کەوا دەکاتە ( پەنجاو شەش ) ساڵ لە تەمەنی

کاتێك ( زەید )کۆچی دوایی کرد لە لای ( ئیبن عباس ) دانیشتین‌و ، دەیگوت :-

{ بەم جۆرە زاناکان ڕۆیشتن ئیمڕۆ زانستێکی زۆر خرایە ژێر گڵ }

کاتێك ( زەیدی کوڕی ثابت ) کۆچی دوایی کرد ( ئەبو هورەیرە ) گوتی :-

{ زانای ئەم ئومەتە کۆچی دوایی کرد ، بەڵکو خوا بکات ( ئیبن عباس ) جێگای ئەو بگرێتەوە }

ڕەزای خوا لە { یاوەری بەڕێزو ئیمامی گەورەی خەزرەجی و ئەنصاری و ، نووسەری نیگاو ، موفتی مەدینەو ، کۆکەرەوەی قورئان‌و ، خاوەن ئاڵا لە تەبووك‌و ، قازی پاك } بێت ...

لە کۆتایی‌دا دەڵێین :-

پەروەردگارا دڵێکی پاکی وەك دڵی ( زەید)و لەخواترسانێکی وەکو ( زەید)و دڵسۆزی‌یەکی وەکو ( زەید )و دەروونێکی بەپەرۆش بۆ جیهادو تێکۆشان وەکو ( زەید )مان پێ ببەخشیت ، ئامین .

* * *

٦٧

# سەعیدی کوڕی زەید

## یەکێک بوو لەم ( دە ) کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێدرا

# {٦٧}

## ❋ سەعیدی کوڕی زەید ❋

## یەکێـك بوو لـــەم ( دە ) کەســەی مـژدەی بەهەشـتیان پـێدرا

( زەیـدی کـوڕی عـەمروی کـوڕی نوفــەیل ) کـە دەکاتــە بـاوکی سـەعید بـە دووره پـەرێزی لـە قەلـەبالغی خـەلّك دەوەستا و دەیبینی قورەیـش ئاهـەنگ دەگـێڕن بـە بۆنـەی جەژنـەکان ، دەیبینـی پیاوەکـان پـەڕۆکی سـپی سونوسـی بـەنرخ لەسـەری خۆیـان دەئالێنن و خۆیان نیشان دەدەن بە جلوبەرگی یەمانی و دەیبینـی ئافرەتـان و منداڵان جوانـترین جلوبـەرگ و خشـلّیان پۆشـیوە تەماشـای چوارپـێکـانی دەکـرد خەلکـە دەولەمـەندەکان پاش ئەوەی دەیانڕازێننەوە بە جۆرەها شتی جوان ، بۆ ئـەوەی لـەژێر دەستی بتەکانیان بیان کەن بە قوربانی و سەریان ببڕن

( زەید ) پشتی خۆی دا بە دیواری کەعبەو وەستا بوو ، گوتی :-

{ ئەی کۆمەڵی قورەیش خوا مەڕی دروست کردووەو ، هەر خۆی باران لە ئاسمان دەهێنێتە خوارەوەو گژوگیا لە زەوی دەڕوێنێ بۆ مەڕەکەو ئـەویش دەیخوات و پـێی تێر دەبێت ، پاشان ئێوە سەری دەبڕن لەسـەر غـەیری نـاوی خـوا مـن واتـان دەبینـم ئێوە میللەتێکی گومڕان }

باوکی ( ئیمامی عومـەر ) کـەوا مـامی بـووو ، نـاوی ( خطـاب ) بـوو شـەقازلەیەکی لێداو ، گوتی :-

داڕزێی ، بەردەوام گوێمان لێت دەبێت لەم قسە سووکانەو دەنگت پێناکەین ، تاکو ئارامـمان لـێبڕا ، پاشان ڕەش و ڕووتـی میللەتەکـەی فـێرکرد ئـازاری بـدەن ئـەوانیش زیادەڕەویـان کـرد لـە ئازاردانی ، تـاکو مەککەی بەجێهێشت و پەنای بردە بـەر چیـای ( حیراء ) ، خـەطاب بە چـەند گـەنجێکی قورەیشـەکانی سپارد ، بەرپـەرچی بدەنـەوەو نەهێڵن بێتەوە ناو مەککە ، ( زەید ) نەدەگەڕاوە ناو مەککە تەنها بە نهێنی نەبێت

پاشان ( زەیدی کوڕی عـەمروی کوڕی نوفـەیل ) لـە ناکـاو کۆبـۆوە لەگـەڵ قورەیـش لەگەڵ ( وەرەقەی کوڕی نەوفل و عبداللەی کوڕی جحش و عثمان کوڕی حارث و امیمـەی کچی عبدالمطلـب پـوری پێغەمبـەرمان ﷺ ، بیریـان لـەم گومڕاییـیە دەکـردەوە کـەوا عەرەبەکان تێیدا نقووم بووبوون ، ( زەید ) بە هاوڕێیەکانی گوت :-

سـوێند بـە خـوا - ئێـوە - بـە ڕاسـتی دەزانـن میللەتەکـەتان لەسـەر هیـچ شـتێك نین و ، وازیان لە ئایینی ( ئیبراهیم ) هێناوەو گوێڕایـەڵی نین ، ئینجا ئێوە ئایینێك بۆ خۆتان هەڵبژێرن و بیکەن بە ئایینی خۆتان ، ئەگەر ئێوە مەبەستتان ڕزگار بوونە

هەر چواریان چوون بۆ لای ئەحبارە جولەکەکان و فەلەکان و خاوەن میللەتـەکان کـەوا لەسەر ئایینی ( ئیبراهیم ) بوون خوایان بە یەکتاپەرستی دەناسی

( وەرەقەی کوڕی نەوفەل ) بوو بە فەلە

هەرچی ( عبداللەی کوڕی جحش و عثمان کوڕی حارث ) نەگەیشتن بە هیچ شتێك بەڵام ( زەید ) چیرۆکێکی هەیە ، با لێ ی گەڕێن خۆی قسەمان بۆ بکات :-

چوومە لای جولەکەو فەلەکان ، ئەم مەسەلەم بۆ باس کردن ، بەڵام شتێکی وام نەبینیوە لێیان بۆ ئەوەی دڵم ئاو بخواتەوە ، ئینجا ڕووم لە دەرەوە کرد دەگەڕام لە دوای ڕێبازی ( ئیبراهیم ) تاکو گەیشتمە وڵاتی شام ، ڕاهیبەکەم بینییەوە لەم وڵاتە لەم زانیارییانەی دەزانی چوومە لای و چیرۆکەکەم بۆ ئەمیش گێڕایەوە ، گوتی :-

ئەی برای مەککە ... دەبینم ئایینی ( ئیبراهیم )ت دەوێت ... !!

گوتم :- بەڵی ، ئەوەیە مەبەستم ، ئەویش گوتی :-

تۆ داوای ئایینێك دەکەیت ئیمڕۆ نادۆزرێتەوە ، بەڵام ڕاستییەکەی لە وڵاتەکەی تۆیە ، خودا یەکێك لە میللەتەکەت پەیدا دەکات ئایینی ( ئیبراهیم ) نوێ دەکاتەوە ، ئەگەر پێ ی گەیشتی بە شوێنی بکەوەو بیگرە .

( زەید ) لەم گەشتە گەڕایەوە بۆ ( مەککە ) هەنگاوی دەهاوێشت بۆ ئەوەی بگات بە پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەکە ...

کاتێك لە ڕێگا بوو خودای گەورە پێغەمبەرەکەی موحەممەدی ﷺ ڕەوانە کرد بە ئایینێکی ڕاست و دروست ، بەڵام ( زەید ) نەیگەیشتێ و کۆمەڵێك لە ئەعرابە ڕێگرەکان بۆی دەرچوون کوشتیان پێش ئەوەی بگات بە مەککەو ، پێش ئەوەی چاوەکانی شاد ببێت بە بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ

پێش ئەوەی ( زەید ) هەناسەی دوایی مەرگ بدات ، دەموچاوی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و گوتی :-

{ پەروەردگارا ئەگەر منت بێبەش کرد لەم خێرە ، کوڕەکەم ( سەعید ) بێبەش مەکە }

خودای گەورە حەزی کرد بە پیر نزاکەی زەیدەوە بێ و ، هەر لەم ساتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بە بانگ کردنی خەڵك بۆ سەر ئیسلام ئەوەبوو ( سەعید کوڕی زەید ) لە موسڵمانە پێشەنگەکان بوو و بڕوای بە خودا هێناو ، پەیامی پێغەمبەرەکەی بە ڕاست دەرهێنا

جێگای سەرسوڕمان نییە ، ( سەعید ) لە ماڵێك پەروەردە بوو دژی ئەم گومڕاییە بوون کەوا قوڕەیش لەسەری بوون ، لە کۆشی باوکێك پەروەردە بوو بە جۆرێك ژیا دەگەڕا لە دۆزینەوەی هەق و ڕاستی

کۆچی دوایی لە کاتێکدا هەناسە بڕکێ ی بوو و بەدوای هەق دەگەڕا

( سەعید ) تەنهاو تەنها خۆی موسڵمان نەبوو ، بەڵکو خێزانەکەی ( فاطمەی کچی خطاب ) خوشکی عومەری کوڕی خطاب لەگەڵی موسڵمان بوو

ئەم گەنجە قوڕەیشییە کەوتە ژێر ئازارو ئەشکەنجەی میللەتەکەی بۆ ئەوەی هەڵیگێڕنەوە لە ئایینەکەی ، بەڵام لە جیاتی ئەوەی وازی پێ بهێنن لە ئیسلام ، خۆی و خێزانەکەی توانیان پیاوێکیان لێ هەڵگێڕنەوە کەوا گەورەترین پلەوپایەی هەبوو لە لایان و گەورەترین مەترسی بوو .

ئەم پیاوەش پاڵەوانی کوردو عەرەب و فارس بوو کەوا هەر هەموو کورد قەرزاری ئەم پیاوەن ، بە هۆی ئەوەوە بوو خودا هیدایەتی داین و ڕزگارمان بوو لە ژێر ستەمی

طاغوتانی ئەم سەردەمە ، ئەم پیاوەش یاوەری بەڕێزو مژدە پێدراوی بەهەشت (عومەری کوڕی خطاب)ە – خوا لێی ڕازی بێت –

ئینجا لێرەدا بە کورتی باسی چیرۆکی موسڵمان بوونی ( ئیمامی عومەر ) دەکەین :-

یاوەری بەڕێز ( خەباب کوڕی ئەرت – خوا لێی ڕازی بێت – دەچووە مالی ( سەعیدی کوڕی زەید ) ، بۆ ئەوەی قورئان فێری ( زەیدو خێزان)ە ژێرو دڵسۆزەکەی بکات .

لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز سەرچاوەو دەستووری مەحکەمی ئیسلامەو ، موسڵمانان تێیدا هەموو هۆیەکانی ژیان‌و ڕۆژی دوایی خۆیان تێدا دەبیننەوە.

بەم جۆرە ( پێنج ساڵ‌و چەند مانگێك ) تێپەڕی بەسەر ناردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ڕۆژگار دەسوڕایەوە بە چەند ڕووداوێکی مەترسی دار ..

ئایا دەبێ چی ڕوویدا لە ئاسۆی مەککە ؟

( عومەری کوڕی خطاب ) شمشێرەکەی هەڵگرت‌و بە خێرایی هەنگاوی دەهاوێشت لە کاتێکی ناوەختدا ، خراپەو شەڕ لە نێوچەوانی دەباری ، تووشی بە تووشی پیاوێکی بڕوادار دەبێت بە شاراوە بڕوای هێنابوو لە ( بەنی زهرة ) بە ( ئیمامی عومەر )ی گوت :-

بۆ کوێ ئۆغر دەکەی ئەی ( عومەر ) ؟

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :- دەمەوێت موحەممەد بکوژم ! بە ڕاستی خەوی لێ‌تاڵ کردووین و جوێن بە خواکانمان دەدات .

ئەو بڕوادارەی بە نهێنی بڕوای هێنابوو پێی گوت :-

ئەی چۆن ئەمین دەبیت لە ( بەنی هاشم و بەنی زهرة ) لەسەر خۆت ئەی ( عومەر ) ؟

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :- وات تێ دەڕوانم تۆ بە دوای موحەممەد کەوتبیت !

بڕوادارەکە گوتی :- ئایا شتێکی سەیرت پێ بڵێم ( ئەی عومەر ) ؟

زاواکەت ( سەعیدی کوڕی زەیدو خوشکەکەت فاطمة ) بە دوای موحەممەد کەوتوون‌و ، باوەڕیان بە ئیسلام هێناوە ، بڕۆ لایان ، تەماشا بکە چی دەکەن

دەم‌وچاوی ( عومەری کوڕی خطاب ) تێك چوو ، خوێن لەناو دەمارەکانی کوڵاو ، ڕووی وەرگێڕاو ڕووی کردە ماڵی ( سەعیدی کوڕی زەید )

( سەعیدو فاطمە ) لە ماڵەوە قورئانیان دەخوێند بە لە خواترسان‌و مل کەچی‌یەوە بۆ یاوەری مەزن ( خەبابی کوڕی ئەرەت ) ، کەوا یەکێك بوو لە ناودارە یاوەرە پێشەنگەکان و یەکێك بوو لەوانەی موسڵمان بوونی ئاشکرا کرد لە مەککەی ڕێز لێ‌گیراو.

( عومەری کوڕی خطاب ) لەبەر دەرگا وەستاو ، گوێی دایە ئەوەی دەیخوێنن زیاتر تووڕەیی پەنگی پێوەگرت‌و ، لێدانی دڵی زیاتر بوو ، بە توندی‌و بە خێرایی لە دەرگای‌دا .

دەرگا کرایەوە ، کاتێك ( خەبابی کوڕی ئەرەت ) گوێی لە ( ئیمامی عومەر )بوو خۆی بزرکرد لە ناو ماڵەکە .

( عومەر ) پرسیاری کرد :- ئایا ئەم مینگە مینگە چی بوو لە ئێوە گوێم لێبوو ؟ لەوانەیە ئایینی باپیرتان گۆڕی بێت ... !!

( سەعیدی کوڕی زەید ) گوتی :-

ئەی ( عومەر ) ئەگەر بینیت ڕاستی غەیری ئایینی تۆ هەیە !

( عومەر ) پەلاماری زاواکەی داو شەقا زللەیەکی بە توندی لێدا

خوشکە ئازاو بە غیرەتەکەی هات لەسەر پیاوەکەی پاڵێکی بە ( عومەر ) نا ، ( عومەر ) یش پاڵێکی زۆر بەهێزی نا بە خوشکەکەی و خوشککەی کەوتە خوارەوەو دەموچاوی پیرۆزی بریندار بوو و خوێنی لێهات .

خوشکە ئازاکەی ( عومەر ) تووڕە بوو و گوتی :-

ئەگەر ڕاستی لە غەیری ئایینی تۆ هەیە ئەی ( عومەر ) من شایەدی دەدەم بە { اشهد أن لا اله الا اللّه و اشهد أن محمد رسول اللّه } چیت نەکردووە بیکە ، کاتێك ( عومەر ) بینی دەموچاوی بە خوێنە سۆزو بەزەیی بۆ هەڵسا

پاشان یەکسەر سێبەری هیدایەت هاتە سەر ( ئیمامی عومەر ) و، گوتی :-

{ ئەم پەرتوکەم بدەنێ }

خوشکە ئازاکەی گوتی :-

{ تۆ پیسی ئەی ( عومەر ) لەبەر ئەوەی تۆ هاوبەش پەیداکەری و هاوبەش پەیداکەران پیسن ، کەس دەست ناداتە قورئان تەنها پاکەکان نەبن ، ئەگەر دەتەوێت بیخوێنیەوە برۆ ( غوسل ) لەخۆت دەربکە }

عومەر ( غوسل )ی لە خۆی دەرکرد و قورئانەکەی بە دەستەوە گرت و لە سەرەتای سورەتی ( طـه )ی خوێندەوە :-

﴿ طـه ما أنزلنا عليك القرآن لتشقى ، الا تذكرة لمن يخشى ، تنزيلا ممن خلق الارض و السموات العلى ، الرحمن على العرش استوى ، له ما في السموات و ما في الارض و ما بينهما و تحت الثرى ﴾ .

ئەمجارەیان ( عومەر ) بە هێمنی و لەسەرەخۆیی و ئەدەب و مل کەچییەوە ، گوتی :-

( ئەم شوێنەم پێ نیشان بدەن کەوا موحەممەدی لێیە )

لێرەدا خەباب لە ژوورەوەی ماڵەکە هاواری کرد :-

{ مزگێنیت بدەمێ ئەی ( عومەر ) پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کردووە ئیسلام بڵند بێت بە یەکێك لە عومەرەکان ، ( عومەری کوڕی خطاب ، یان عەمرو کوڕی هیشام ) تکام وایە لەسەرەتۆ ئەم دوعایە بەڕاست دەرکەوێت } ، بەم جۆرە ماڵی قارەمانی بیوێنەمان ( سەعیدی کوڕی زەید ) مەزنترین دیاری پێشکەش بە موسڵمانان کرد بە موسڵمان بوونی ( ئیمامی عومەر ) - خوا لێی ڕازی بێت -

سەعید - خوا لێی ڕازی بێت - پیاوێکی ڕەشتاڵەی درێژی - پرچ درێژ بوو -

خۆی و خێزانەکەی ( فاطمة ) کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینەی ڕوناك ، پایتەختی نوێی دەوڵەتی ئیسلامی ، لێرەدا لەسەر میوانداری ( رفاعەی کوڕی منذر ) ، برای ئەبو لوبابە دابەزین .

ئینجا لێرەوە جیهادی ( سەعیدی کوڕی زەید ) دەست پێدەکات بە پێش کەش کردنی گیان و ماڵ لە ڕێگای خوای گەورە

یەکەم کار ( سەعیدی کوڕی زەیدو طلحـەی کوڕی عبیداللـه ) پـێ ی هەڵسـان بـە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کاتێك پێیان گەیشت کاروانـەکانی قورەیـش لـە شـام دەگەڕێنـەوە ، کـەوا بـاری جۆرەهـا بازرگانی‌یـان هـەڵگرتووە ، ئـەم دوو یـاوەرە بـەڕێزە ناردران بۆ هەواڵی ئەم کاروانانە ، بۆی دەرچوون تا گەیشتن بە ( حوراء ) کاتێك گەیشتن بەم کاروانە کە بە پێشیان تێپەڕین ، گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی هەواڵی بدەنێ

بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەواڵی کاروانەکـەی پێگەیشـتبوو ، بـە پەلـە لەگـەڵ یاوەرەکـانی دەیویسـت پێـیـان بگـات ، بـەڵام کارەکـەیان گـۆڕی بـۆ جـەنگ لـە جـەنگی بـەدری گـەورە ، تێیـدا موسـڵمانان سـەرکەوتن و هاوبـەش پەیداکـەران گـەورەترین شکستیان خوارد .

کاتێك ئەم دوو یاوەرە ( طلحه و سعید ) گەڕانەوە مەدینە ، گوێ بیست بوون بە دەرچوونی موسڵمانان بۆ جەنگ ، پشوویان نەدا لە ماندووبوونی سەفەر ، هەڵنەهاتن لەبەر جیهاد ، بەڵکو گەیشتن پێیان ئەم هۆنراوەیان خوێندەوە :-

رکضا الی الله بغیر زاد غیر التقی و عمل المعاد

لێرەدا هیواو ئامانجی ئەم دوو یاوەرە ئەوەبوو شمشێریان بگات بەسەر ملی ئـەم گاورانەو ، بەدیارکەون لە گۆڕەپانی جیهاددا

بەڵام مەخابن کاتێك گەیشتن بە گۆڕەپانی جەنگ بینی‌یان پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە جـەنگی گـاوران تـەواو بـووە ، ئـەوانیش زۆر خـەمیان خـوارد لـە بێبـەش بوونیـان لەم گەورەیی‌یە .

پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە پـاکی نیـازی ئەمانـەی زانـی و بڕیـاری‌دا بەشـیان دان لـە غەنیمەت وەکو موجاهیدێك ...

یاوەری بەڕێزمان زۆر پاڵەوانیەتی تری نیشان دا ، لە جەنگەکانی ( ئوحدو خەندەق و خەیبـەر و فـەتحی مەککـەو حونـەین ) هـەموو دیمانـەکانی بینـی لەگـەڵ پێغەمبـەری خوا ﷺ هەروەها لە جەنگی هەڵگەڕاوەکانیش دەورێکی گرنگی گێڕا

( سـەعید ) بەشداری کرد لەگەڵ موسڵمانان لـە گرتنـی عەرشـی کیسـراو تێکدانـی موڵکی قەیسـەر ، لە هـەموو دیمانـەکان هەڵوێسـتی مەردانـەی نیشان داو جێگـای سـپی دەستی دیار بوو ... پاش ئەمانە ( سەعیدی کوڕی زەید ) بەشـداری فەتحی دیمەشـقی کرد ، کاتێك خەڵکەکە مـل کـەچی فەرمانـەکانی موسـڵمانان بـوون ، ( ئـەبو عوبـەیدەی کوڕی جەراح ) کردی بە فەرمانڕەوا لەسەر دیمەشق ، ئینجا ( سەعید ) یەکەم کەس بوو فەرمانڕەوایەتی دیمەشقی وەرگرت

بەڵام لە زەمانی ئەمەوی‌یەکان و ( بەنی ئومەی‌یە ) ڕووداویك ڕووی دا ، بۆ ماوەیەکی زۆر خەلکی مەدینە دەیان گیرایەوە

ئەمەش گوایە ( اروی کچی اویس ) بلاوی کردبووەوە کەوا ( سەعیدی کوڕی زەید ) هەندێك لە زەوی‌یەکەی زەوت کردووەو بە زەوی‌یەکی خۆی وەناوە ، ئەمەش ببووە بنێشتە شینکە لەناو موسڵمانان باسیان دەکرد ، پاشان ئەم کارە بەرزکرایەوە بۆ ( مەروانی کوڕی حەکەم ) فەرمانڕەوای مەدینە ، ( مەروان ) چەند کەسێکی نارد بۆ ئەوەی قسە بکەن لەگەڵ ( سەعید ) لەم بارەیەوە ، ئەم کارەش گران بو لەسەر یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی :-

وا دەزانن ستەمم لێ ی کردووە !! چۆن ستەمی لێ‌دەکەم ؟!

گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی :- { هەرکەسێك بستێك لە زەوی ستەم بکات ، لە ڕۆژی دوایی خودا لە حەوت چینی زەوی دەیباتە خوارەوە }

پەروەردگارا ئەم ئافرەتە وا ڕادەگەیەنێ من ستەمم لێ ی کردووە ، ئەگەر درۆ دەکات ، کوێری بکەیت‌و بیخەیتە ئەم بیرەی کێشەی دەکات لەسەری لەگەڵم ، بۆ موسڵمانان ئاشکرا بکەیت و مافم بەدیار بخەیت من ستەمم لێ ی نەکردووە ، ئەمە زۆری نەبرد تا بارانێك باری ، کەندەرانی وای دروست کرد چەشنی نەبوو ، ئەم سنوورەی نێوانیانی ئاشکرا کرد کەوا ناکۆکیان هەبوو تێیدا ، موسڵمانان بۆیان دەرکەوت ( سەعید ) ڕاست دەکات ...

یەك مانگی نەبرد ئافرەتەکە کوێر بوو ، جارێکیان لەسەر زەوی‌یەکەی دەسوڕایەوە ، کەوتە ناو بیرەکەی خۆی

( عبداللەی کوڕی عومەر ) - خوا لێ ی ڕازی بێت - دەڵێت :-

(( ئێمە منداڵ بووین گوێمان لە قسەیان دەبوو دەیانگوت :- { خوا کوێرت بکات هەروەك ( اروی ) کوێر بوو } ))

ئەم ڕووداوەش جێگای سەرسام بوون نی‌یە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو :-

(( خۆتان بپارێزن لە دوعای ستەم لێکراو ، لە نێوان ئەم و خودا دا پەردە نی‌یە ))

ئینجا ئەمە چۆن دەبێت خۆشەویستێکی خۆی یەکێك لە مژدە پێدراوانی بە هەشت ستەمی لێ‌بکرێت .

ئەوەی لێشمان ڕوونە ئەوەیە زۆر لە خەڵکان پێشبڕکێ دەکەن لەسەر کورسی و دەسەڵات‌و داوای گەورەیی دەکەن ، بۆ ئەوەی پارەو موڵکیان دەست بکەوێت‌و ، ئارەزووی خۆیان تێر بکەن‌و فەرمان لەسەر بەندەکانی خوا بکەن ، بە ئارەزووی خۆیان ستەم بکەن ..

ئەم جۆرە کەسانە نازانن لێپرسراوەتی لە لایەن خوا لێپرسینەوەیەکی ووردی هەیە ، ڕۆژانە گوێمان لێ‌دەبێت چەند کەس بەرتیل‌و پارە دەدەن بۆ ئەوەی ببن بە وەزیر یان بەڕێوەبەرێك ..

ئینجا لێرەدا هەلویستێکی تری بەرزی ( سەعیدمان ) بۆ دەردەکەویت ، لە کاتێك جلەوی دەروونی خۆی بە تەواوی گرتبوو و ، دوور دەکەوتەوە لە لێپرسراوەتی ، خۆی لێ ی لا دەدا ، بەلام پاشان تووشی بووو ، بووە بە فەرمانڕەوا

هەرچەندە هەلاتنی ( سەعید ) لەبەر فەرمانڕەوایی و لێپرسراوەتی نەبوو ، بەلکو حەزنەکردنی ( سەعید ) بەم کارە لەبەر گەرانی بە دوای جیهادو شەهادەت بوو

هـەر ئـەم هۆیەیـە وامـان لـێدەکات تەماشـای یـاوەری بـەڕێز بکـەین جێگـای خۆشەویستی و ڕێزی موسڵمانان بێت

ئەمەش کاتێك بوو موجاهیدی گـەورەمان بەشـداری گرتنـی فـەتحی شـامی دەکـرد لەگەڵ سوپای ئیسلامی ، پاش ئـەوەی فـەتحی شـام تـەواو بـوو ( ئـەبو عوبـەیدەی کـوڕی جەڕاح ) کردی بە فەرمانڕەوای دیمەشق ، لەبەر ئەوەی شایەنی ئەم پلەوپایەیە بوو بـە هۆی دەست پاکیی و ، ڕاستگۆیی و ، خواپەرستی‌یەکەی

بەڵام ( سەعید ) لەگەڵ دەروونی خۆیدا دانیشت و بینی بێبەش دەبێت لە جیهاد بـە هۆی فەرمانڕەوایەتی ، ئینجا بیری لە فەرمانڕەوایەتی کردە وەو بە کەمی زانی ، بـە هـۆی ئـەم زوهـەدەی هـەیبوو ، لەبـەر ئـەوە نامەیـەکی بـۆ ( ئـەبو عوبـەیدە ) نووسـی داوای کشانەوەی لە فەرمانڕەوایەتی کرد بەم جۆرە قارەمانی بێوێنەمان بووە بە سەربازێك لە لەشکری ئیسلامی موجاهید

ئینجا جێگای خۆیەتی پێغەمبـەری خوا ﷺ مژدەی ئەم ویسامە مەزنـەی پـێبدات کە دەفەرمووێت :-

{ ئەبوبەکری صدیق لە بەهەشتەو ، عومەری کوڕی خطاب لەبەهەشتەو ، سەعیدی کوڕی زەید لە بەهەشتەو ، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح لە بە هەشتەو ، سەعدی کوڕی مالك لە بەهەشتەو ، عبدالرحمن کوڕی عەوف لە بە هەشتە }

بەم جۆرە ژیانی ( سـەعید ) درێژ بووەوەو ، کەوا پڕ بوو لە خێروبەرەکەت وێنـەی کەم بوو ، هـەروەها دەبینین ( ئیمامی عومەری کوڕی خطـاب ) نـاوی ( سەعیدی کوڕی زەیـدی ) ناهێنێت لـە کۆمـەڵی ڕاوێـژ لـە پـاش خـۆی هەرچـەندە ( سـەعید ) زاوایـەکی خۆشەویستی ( ئیمامە ) ، ئەم هۆیەش دەگەڕێتەوە بۆ تەرازووی ووردبینی ( ئیمـام ) کە وا دەڕوانـی کوڕەکـەی ( عبداللـە ) و ( زاواکـەی سـەعید ) دوور بکەونـەوە لـەم کـارە مەترسی‌دارە کەوا ڕۆژیی دوایی لێپرسینەوەیەکی ووردی لەدواوەیە

( سـەعید کـوڕی زەیـد ) کوچـی دوایـی دەکـات ، هـەڵیدەگرن و لـە مەدینـە شـاری پێغەمبـەری خوا ﷺ دەیشارنەوە ئەمـەش لـە ساڵی ( پەنجا ) یاخود ( پەنجاو یـەکی ) کۆچی دەبێت

کۆچی دوایی‌یەکەی لە ڕۆژی هەینی دەبێ و ئەم دوو یاوەرە بەڕێزە ( سەعدی کوڕی ئـەبی وەقاص و عبداللـەی کوڕی عومـەر ) سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەکـەن - خـودای گەورە لە هەموویان ڕازی بێت -

ڕەزای خوات لێ‌بێت ئەی ( سەعید کوڕی زەید ) :-

{ بەڕاستی باوکت بە تەنها ئومەتێك بوو ، تۆش لە دوای ئـەو ئومـەتێك بـووی - خـوا لـێی ڕازی بێت - هـەروەك لێت ڕازی بوو ، مژدەی بەهەشـتێکی پـێدایت فراوانیـەکی ئەوەندەی عاردو ئاسمانە }

خودای گەورە بە یەکەوە لەم شوێنە شادمان بکات . ئامین

* * *

٦٨

# ﴿ سەعدی کوڕی عوبادە ﴾

# هەڵگری ئاڵای ئەنصـــارەکان

## {٦٨}

# ﴿ سەعدى كوڕى عوبادە ﴾
# هەڵگری ئاڵای ئەنصارەکان

ئەم گەنجە خەزرەجی‌یە بەیانیان لەگەڵ ڕۆژهەڵات لە خەو هەڵدەستاو ، نانی بەیانی دەخوارد ، پاشان سواری سەرپشتی ئەسپەکەی دەبوو ڕووی دەکردە دەشتایی بۆ ڕاوکردنی مامزو کەمتیار ، کاتێك گەرمای بیابان تینی بۆ دەهێناو ماندوو دەبوو ، دەچووە ژێر سێبەری دارێك ماندووبوونی دەحەسایەوەو پشیە خەوێکی دەکرد ، لە دواییدا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، منداڵان دەوریان دەدا لە هەموو لایەك ئەم گۆشتە تەڕەی گەورەیان ڕاوی کردبوو سوۆریان دەکردەو دەیان خوارد ، پاش خواردن‌و تێربوون دەگەڕانەوە ماڵەوەیان ، بۆ ئەوەی هەریەکێکیان بچن لە شوێنێکی بڵند بانگ بکەن ، بەهەموو هێزی خۆیان :

{ هەر کەسێك گۆشت‌و چەورایی دەوێت بابێت بۆ لای ( سەعدی کوڕی عوبادە ) }

بەم جۆرە هەموو ڕۆژێك ئەمە پیشەی ( سەعد ) بوو بۆیان مابووەوە لە باوکی ( عوبادە)و باپیرەی ( دولەیم ) ، هەر لە منداڵی‌یەوە بەم خووە گەورە بووبوو ڕاستە عەرەب دەڵێت :-

(( ومن شبَّ على شيءٍ شابَ عليه ))

بەم سیفەتە سەخاوەتەی توانی ببێت بە گەورەی بنەماڵەکەی ( بەنی ساعدە )و هۆزەکەی ( خەزرەج ) ....

هەر کاتێکیش ناوی ( سەعدی کوڕی موعاذ ) بێت ئەوا ناوی ( سەعدی کوڕی عوبادە )ش لەگەڵی دێت .

ئەمانە هەردووکیان گەورەی خەڵکی مەدینە بوون ...

( سەعدی کوڕی موعاذ ) گەورەی ئەوس بوو .

( سەعدی کوڕی عوبادە ) گەورەی خەزرەج بوو .

ڕۆژێك ( سەعدی کوڕی عوبادە ) ، دەگات بە ( ئەسعەدی کوڕی زرارە)و سەفیری پێغەمبەری خوا ﷺ ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) لە ( یەثریب ) ، ئیسلامیان پێشنیار کردو قورئانیان بۆ خوێندەوە خودای گەورە دڵی جۆش دا بۆ ئیسلام‌و موسڵمان بوو ، پاشان ئەویش گەیاندی بە بنەماڵەکەی ( بەنی ساعدە ) و داوای کردن باوەڕ بە ئیسلام بهێنن ، بتەکانی شکاندن‌و ، بە موسڵمان بوونی خەڵکێکی یەکجار زۆر لە خەزرەجی‌یەکان لە هۆزەکەی موسڵمان بوون ..

کاتێك کاتی حەج کردن هات ، ( سەعد ) لەگەڵ نوێنەرێك لە خەڵکی ( یەثریب ) هات بۆ مەککە بۆ بەجێهێنانی حەجی ماڵی خودا بۆ ئەوەی بگات بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا بەڵێنی پێدابوون بە چاوپێکەوتنیان لە ( عەقەبە ) ، لە شەوەکانی ( مینا ) ، کاتێك

کاتی پێگەیشتنەکە هات ، ئەنصارەکان بە نهێنییەوە بۆی دەرچوون ، گەیشتن بە پێغەمبەر ﷺ و مامی ( عەباس )

بەڵام ( عەباس ) تا ئەو کاتە لەسەر ئایینی میللەتەکی بوو – بەڵام حەزی دەکرد پەیوەندی ببەستێ لەگەڵ برازاکەی ، ئەنصارەکان حەفتا پیاوو دوو ئافرەت بوون

پاش ئەوەی پەیمانی ( عەقەبە ) تەواو بوو بە نهێنی ، ئەنصارەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ گەڕانەوە ، قورەیشەکان بەم پەیمانەی ئەنصارەکانو ئەم ڕێککەوتنەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ زانی کەوا کۆچ بکەن بۆ مەدینە ، پاشان لەگەڵی وەستان دژی هێزی کوفرو تاریکی

ئەمەش شتێکی ئاسایی بوو کەوا ئازاری قورەیش دەگەیشت بە ئەوانەی دەوروبەریانو ئەوانەی لە ناوەوەی مەککە دەژیان

ئینجا ئایا دەبێت پیاوێك بەرەنگاری ئەم ئازارەی قورەیش بێت      ئەمەش تەنها پیاوێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو گەورەی هۆزێك بوو ، تەنهاو تەنها ئەم پیاوەش تووشی ئەم ئازارە بوو ..

پاش ئەوەی قورەیش شێتانی گرتنیو ، کەوتنە دوای ڕێبوارەکان گەیشتن بە ( سەعدی کوڕی عوبادە ) و گاورەکان دەسگیریان کرد ، دەستەکانیان بە پەتی ولاخەکەی لە ملیان بەستەوەو گەڕانەوە بۆ شاری مەککە ، گاورەکان دەورەیان لێداو بە هەموویان بە زۆر جۆر ئەشکەنجەو ئازاریان دان .

ئینجا دەبێت ( سەعدی کوڕی عوبادە ) ئەمەی پێ بکرێ ؟

گەورەی شاری مەدینە ، بەردەوام میوانداری ئەوانی دەکرد ، بازرگانەکانی دەپاراستنو ، ڕێزی لە نوێنەرکانی دەگرتن تاکو مەدینەیان بەجێدەهێشت ...؟؟

بەڵام ئەوانەی ( سەعد)یان گرتبوو ، ئەوانەی لێیان دەدا نەدەیان ناسیو نە پلەوپایەیان دەزانی لە نێو میللەتەکەی

ئینجا ئەگەر بیاناسیبا وازیان لێی دەهێنا ؟!

ئایا ئەو گەورانەی مەککە بوون بە موسڵمان ئازار نەدران ؟

قورەیش لەم ڕۆژگارەدا هار بووبوونو ، هەموو توانایەکی نەزانیان ئامادەبوو !!! بۆ کەوتنیان بەسەر کوتکی هەق دا ، ئەم هەڵوێستە خراپەشیان تەنها بۆ سارێژکردنی برینەکانی دڵیان بوو

گاوەرکانیمەککە هەروەکو گوتمان دەورەی(سەعدی کوڕی عوبادە )یان داو دەست درێژییان کردە سەریان با لێرەدا کۆتایی بە قسەکانمان بۆ خودی ( سەعد ) بەجێبهێڵین ئەم هەواڵەمان بۆ بگێڕێتەوە :-

{ سوێند بە خوا من کەوتبورمە ژێر دەستیان پیاوێك لە قورەیشەکان بۆ لام هات ، پیاوێکی سپی ، دەموچاو پاك بوو ، دیار بوو لە نێو پیاوەکانیان

(( لە دڵی خۆمدا گوتم :- لەوانەیە ئەم پاوە لە نێو میللەتەکەی جێگای خێر بێت ، لەم کاتەدا ... کاتێك لێم نزیك بویەوە ، دەستی بڵند کرد. مستێکی بەهێزی لێدام ...

لە دڵی خۆم دا گوتم :-

تا سوێند بە خوا ، پاش ئەمە هیچ کەسێکیان نییە جێگای خێر بێت !!

سوێند بە خوا من لەبەر دەستیان بووم ڕایاندەکێشام پیاوێك لەگەڵیان بوو لێم نزیك بوویەوە گوتی :-

خاکت بەسەر ، ئایا هیچ لە نێوان تۆو یەکێك لە قورەیشەکان دراوسێیەکت نییە ...؟

گوتـــــم :-

بــەڵێ .... مــن پــەنای ( جوبــەیری کــوڕی موطعــــە)وبازرگانــەکانی ئــەوم دەداو ، دەمپاراستن لەوانەی دەیانویست دەست درێژیان لێبکەن لە وڵاتەکەم ، هەروەها پەنای ( حارث کوڕی حرب کوڕی ئومەیە ) م داوە

( پیاوەکە گوتی :- بانگی ئەم دوو پیاوە بکەو ، ئەو پەیوەندیەی لە نێوان تۆو ئەوان هەیە باسیان بکە ) ، منیش ئەم کارەم کرد

( پیاوەکە چوو بۆ لایانو ، هەواڵی دانێ کەوا پیاوێك لە ( ابطح ) لێی دەدرێت ، بانگی کرد بەناوی ئەوان و ، باسی پەیوەندی نێوان ئەمانو ئەوی کرد

( پرسیاری ناوی منیان لێکردن ... گوتی :( سەعدی کوڕی عوبادە )

گوتیـــــان :-

سوێند بە خوا ، ڕاست دەکات ، هاتنو منیان لەژێر دەستیان ڕزگار کرد

پاشان ( سەعد ) مەککەی بەجێهێشت پاش ئەم دەست درێژییەی کە کردیانە سەری ، بەم جۆرە بۆی دەرکەوت قورەیشیەکان چەند ستەمیان لەم کۆمەڵە بێچەکەی خۆیان کردووە ، کەوا داوایان لێدەکردن بۆ چاکەو ، هەقو ، ئاشت بوونەوە

ئەم کارەی بە ( سەعد ) یان کرد وورەی بەرز کردەوە ، بڕیاریدا تاکو کۆتا هەناسەی یارمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرەکانی و ئیسلام بدات

یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچیان کرد بۆ مەدینە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئینجا لێرەدا ( سەعد ) هەموو ماڵی خۆی بۆ خزمەتی کۆچکردووەکان دانا

بە هۆی ئەم سەخاوەتیەی ( سەعد ) هەیبوو لە پێش ئیسلام دا

ئەنصارەکان دوو پیاو یان سێ پیاوی موهاجیرەکانیان میوانداری دەکرد بۆ ئەوەی نانیان بدەن ، بەڵام ( سەعد ) هەشتا کەس دەبوو بە میوانی

لەبەر ئەوە ( سەعد ) لە خوا دەپاڕایەوەو دەیگوت :-

{ اللّهم هب لي حمداً ... و هب لي مجداً لا مجدَ الا بفعال ، ولا فِعالَ الا بمال ، اللّهم انه لا يُصْلحني القليلُ ، ولا أصلُحُ عليه }

پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ دەکردو دەیفەرموو :-

{ اللّهم اجعل صلواتك و رحمتك على آل سعد بن عبادة }

بەم جۆرە قاپی خواردەمەنی ( سەعد ) لە هەموو ماڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەسوڕایەوە .. ماڵو سامانی ( سەعد ) بە تەنها لە خزمەتی ئیسلام نەبوو ، بەڵکو هێزو زیرەکی خۆشی لەم پێناوەدا بەخشی

( سەعد ) تاکو بڵێیت ڕم هاوێژێکی چاك بوو ، لە جەنگەکان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گیان بازێکی بێ وێنەی ئازا بوو

( عبداللەی کوڕی عەباس ) – خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێت :–
{ پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو دیمانەکان دوو ئاڵای هەبوو }
ئاڵای کۆچکردووەکان لە دەست (عەلی کوڕی ئەبو طالب ) بوو
ئاڵای یاریدەدەرەکان لە دەست سەعدی کوڕی عوبادە بوو
وا دیار بوو توندی سیفەتێك بوو لە کەسایەتی ئەم یاوەرە بەڕێزە زۆر توند بوو لەسەر هەقێك کەوا لە دەروونی خۆی بە ڕاستی دەزانی واتە زۆر توند بوو لەسەر هەق

ئەگەر قەناعەتی بەکارێك بهاتبایە بۆی هەڵدەستایەوە بە ئاشکرا بانگی بۆ دەکرد ، ئەخشەیەکی هەبوو نەیدەزانی شلی و و نەرمی مانای چی‌یە ''
ئەم توندیەش بووبوو بە هۆیەك جاران کارێکی بە نیازێکی پاك دەکرد، بەڵام لە کۆتایی‌یەکەی بەسەری‌دا دەشکایەوە
ئەوەتە لە کاتی فەتحی مەککە پاش ئەوەی قوریشەکان پەیمانیان هەڵوەشاندەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی ( دە هەزاری ) لە کۆچکردووەکان و یاریدەدەرەکان بۆ ئامادە کرد ، کاتێك ( ئەبو سوفیان ) تووشیان بوو لە ( ظهران ) هەستی بەم هەواڵە کرد( ئیمام عەباس ) مامی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی پێشنیار کرد ئەویش موسڵمان بوو ، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە مامی کرد بووەستێت لەگەڵ ( ئەبو سوفیان ) تاکو سوپا بە پێشیدا بڕوات و هێزوشەوکەتیان بەدیار بکەوێت ، ( سەعدی کوڕی عوبادە ) – خوا لێی ڕازی بێت – هەڵگری ئاڵای پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێشەوەی کەتیبەیەك بڕو، لە خۆپیشاندانێکی سوپا بەرامبەر ( ئەبو سوفیان ) – کاتێك گەیشتە بەرامبەر ( ئەبو سوفیان ) ، ( سەعد ) بانگی کرد ، { ئەی ( ئەبو سوفیان ) ئیمڕۆ ڕۆژی داستان تۆمار کردنە ، ئیمڕۆ ئەم شتانەی قەدەغە بوون ڕێگایان پێ‌دەدرێت ، ئیمڕۆ خودا قوڕەیش ڕیسوا دەکات }
( ئەبو سوفیان ) کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای‌دا تێپەڕی بانگی کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت کردووە بە کوشتنی میللەتەکەت ؟ ( سەعد )وئەوەی لەگەڵی دان ئەم قسەیە دەکەن ، من بانگت دەکەم بۆ لای خودا بۆ میللەتەکەت ، تۆ چاکترینی خەڵك و بەزەیی‌ترینی خەڵك و لە هەموو کەس زیاتر هاموشۆ دەکەیت
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :–
ئەی ( ئەبو سوفیان ) ، ئیمڕۆ ڕۆژی بەبەزەیی‌یە ، ئیمڕۆ خودا قوڕەیش سەربڵند دەکات
پاشان فەرمانی کرد ئاڵاکە لە سەعد ) وەربگیرێتەوەو بدرێت بە ( قەیس )ی کوڕی ، کاتێك بینی ئاڵاکە لەوان نەچووە دەرەوە درا بە کوڕەکەی بەمە کەیف خۆش بوو

بەم جۆرە لەشکر لە سەرەوە بە سەرکردایەتی ( زوبەیر )و لە خوارەوە بە سەرکردایەتی ( خالیدی کوڕی وەلید ) هاتە ناو مەککە

قەدەغەکران لە جەنگ تەنها ئەوەی جەنگیان لەگەڵ دەکات .

( صفوان کوڕی ئومەیەو عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهلو سهیل کوڕی عمرو ) خەڵکیان کۆکردەوە لە چیای ( خەندەمە ) بۆ جەنگ کردن ، کاتێك ( خالید ) لەلای ( خەندەمە ) بۆیان هات ، نەیهێشت بێنە ژوورەوە ، هەندێك شەڕە شمشێری لەگەڵ کردن و شکستیان خوارد .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ( کداء ) بەسواری وشترێك هاتە ژوورەوە ، بەیانی ڕۆژی هەینی ، زۆر بە مل کەچی‌یەوە بۆ خوداو دەیفەرموو :

{ اللّهم إنَّ العيشَ عيشُ الآخرة }.

پاشان ڕووی لە کەعبە کرد ، بەردە ڕەشەکەی وەرگرتو ، بە سواری وشترەکەیەوە دەوری کەعبە سوڕایەوە پاشان ئەم بتانەی دەورەی کەعبەی شکاندو ، دەیفەرموو :-

{ جاء الحق و زهق الباطل ، إن الباطل كان زهوقا }

پاشان لە پشتەوەی ( مەقام ) دوو ڕکات نوێژی کردو لە لای مزگەوت دانیشتو ، بیلالی ڕەوانەی لای ( عثمان کوڕی طلحە ) کرد کلیلی کەعبەی هێناو پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگای کەعبەی کردەوەو چوونە ژوورەوە دوو ڕکات نوێژی کرد ، پاشان چووە دەرەوە وەستا لەسەر دەرگای ماڵی خوا ، حەمدو سوپاسی خوای گەورەی کرد ، لەسەر ڕاستی بەڵێنەکەی‌و سەرخستنی بەندەکانی‌و ، شکست هێنان بە ڕێچکە شەیتانی‌یەکان .

پاشان بە هۆی ئەم بەزەیی‌و لێ‌خۆش بوونەوەی هەیبوو لێبووردنەکی گشتی بۆ خەڵکی مەککە دەرکرد و ، وتارێکی بەنرخی بۆ خوێندنەوە کە پڕ بوو لە پەندو ئامۆژگاری ...

پاشان مێرخاسانو یاوەران موبایەعەیان دا لەسەر :-

گوێڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام ، ئینجا خەڵك پۆل پۆل دەهاتن بۆ ناو ئیسلام ، ئەم سەرکەوتنە مەزنە لە سورەتی ( فتح ) مزگێنی دا بە موسڵمانان .

کاتێك شاری مەککە فەتح کرا هەموو هۆزە عەرەبەکان گوێڕایەڵو مل کەچ بوون بۆ ئیسلام ، تەنها هۆزی ( هەوازن‌و ثقیف ) نەبێت ، ئەمانە یاخی بوون .

هەرکە ( هەوازن ) گوێ بیست بوون لە فەتحی مەککە ، سەرۆکەکەیان ( مالیك کوڕی عەوف ) خەڵکانێکی زۆری کۆکردەوە لە ( هەوازن‌و ثقیف ) ... تاکو ژمارەیان گەیشتە سی هەزار جەنگاوەر ، ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە دۆڵی حونەین ... ئەوەبوو ماڵو منداڵو ئافرەتیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ...

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەم هەواڵەی زانی ( دوازدە هەزار ) جەنگاوەری بۆ کۆکردەنەوە کە پێکهاتبوو لە ( دە هەزار ) موهاجیرو ئەنصارو ( دوو هەزار ) موسڵمانانی فەتحی مەککە .

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەیانی لەشکرەکەی دابەش کرد بە چەند ریزێك ، ئالاکانی دا دەست خەڵکەکە

ئالای موهاجیران ( عەلی کوڕی ئەبو طالب ) هەڵیگرت و ئالای ئەنصارەکان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ) هەڵیگرت

ئالای خەزرەجی یەکان ( سەعدی کوڕی عوبادە ) هەڵیگرت و ئالای ئەوس ( ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ) هەڵیگرت ، ئەوەبوو سەرەتا جەنگەکە شکایەوە بەسەر موسڵمانان بە هۆی شانازی کردن بە زۆری ژمارەیان ، بەڵام لە دوایی دا خوای گەورە سەرکەوتنی خۆی بۆ ڕەوانە کردن ( هەوازن و ثقیف ) بە موڵك وماڵەوە بوون بە غەنیمەی موسڵمانان ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ غەنیمەکانی لە ( جەعرانە ) دانا تاکو گەڕایەوە لە گەمارۆی ( طائف ) کاتێك هاوبەش پەیداکەران شکستیان خوارد ( مالك کوڕی عەوف ) گەورەی هەوازن هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و بوو بە موسڵمان ، موڵك و ماڵی دایەوە ، لەگەڵ سەد وشترو ، کردیەوە گەورەی هۆزەکەی

پاش گەڕانەوەیان لە گەمارۆی ( طائف ) هات بۆ ( جەعرانە )و ماڵە غەنیمەکەی دابەش کرد بەسەر ئەوانەی تازە ببوون بە موسڵمان و پێویستی یەکان لە موهاجیرو ئەنصار – کاتێك ئەنصارەکان بینی یان غەنیمەکە دابەش کرا بەسەر تازە موسڵمانەکانی مەککە ، دەستیان کرد بە پرتەو بۆڵە ، بە یەکتریان دەگوت :–

پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە میللەتەکەی خۆی بانگمان دەکات بۆ ناخۆشی و ، غەنیمەت دەدات بە غەیری ئێمە

کاتێك گەورەی ئەنصارەکان ( سەعدی کوڕی عوبادە ) گوێی لەم پرتەو بۆڵە دەبێت کەوا میللەتەکەی دەیکەن ، بەم هەڵوێستە ڕازی نابێت ، هەروەکو سیفەتی سروشتی خۆی ناتوانێت هیچ شتێك لە دڵی خۆی بێڵێتەوە ، یەکسەر دەڕوات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەڵێت :–

{ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کۆمەڵە لە ئەنصارەکان شتێکیان لە دڵ دروست بووە دەربارەی ئەم غەنیمەی دابەشت کردووە

بەسەر میللەتەکەت دابەشت کرد و بەشی گەورەت دا بە هۆزە عەرەبەکان و هیچ شتێکت نەدا بە ئەنصارەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ کرد :–

ئەی تۆ لەم بارەیەوە چی دەڵێت ئەی ( سەعد ) ؟

واتە :– ئەگەر ئەمە بیروڕای میللەتەکەت بێت ، بیروڕای تۆ چۆنە ؟

( سەعد ) بەڕاستی و ڕاشکاوی و بە بێ ئەوەی هیچ شتێك لە دڵی خۆی بێڵێتەوە گوتی :–

بیروڕای منیش بیروڕای میللەتەکەمە

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :–

{ کەواتە میللەتەکەی خۆتم بۆ کۆبکەرەوە }

ئینجا دەبێت لێرەدا گوێ بیستی ئەم چیرۆکە بین تا کۆتایی ، لەبەر ئەوەی بۆنو بەرامێکی وای تیایە ناتوانرێت نکوڵی لێ بکرێت ....!!

پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لایان و ، بینی ئەموچاویان خەمبارە پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی بردەوە کەوا پەیوەند بوو بە کردەوە باش و چاکە جوانەکانیان .. پاشان فەرمووی :-

ئەی کۆمەڵی ئەنصار ...

قسەیەکی ئێوەم پێگەیشتووە ، شتێکە لە دەروونتان دروست بووە لەسەر من ... ؟!

من نەهاتم ئێوە لەسەر گومڕایی بوون خودا هیدایەتی دان ... !!؟

هەژار بوون ، خوا دەوڵەمەندی کردن .....؟؟

دوژمنی یەکتر بوون ، خودا دڵەکانی بۆ یەکتر هێنانەوە ....؟.

گوتیان :-

بەڵێ .. خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ گەورەترن و منەتیان لەسەر ئێمە هەیە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

بۆچی وەڵامم نادەنەوە ئەی کۆمەڵی ئەنصار ... ؟؟

گوتیان :- بەچی وەڵامت بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟؟

خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ منەت و گەورەیی یان هەیە لەسەر ئێمە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

{ سوێند بە خوا هەر شتێك حەزی پێبکەن و بیڵێن ، ڕاست دەکەن و بڕواشتان پێ دەکرێ ... بەدرۆیان خستبووینەوە ، هاتین بۆ لاتان بڕواتان پێکردین بێهێزو ژێر دەستە بووین ، ئێوە بوونە پشتیوان و بەهێزتان کردین .. بێ کەس بووین ، ئێوە بوونە کەسمان ، بێ جێگەو ڕێگە بووین ، ئێوە جێگاتان بۆ کردینەوە ..

ئەی کۆمەڵی ئەنصار ئایا ئێوە شتێکتان لە دەروونتان شاردۆتەوە لە چڵکی دونیا دڵی کۆمەڵێکم پێ خۆش کردووە تازە هاتوونەتە ناو ئیسلام و بە هەموو مانایەك ئیسلامم بۆ ئێوە جێهێشتووە ... ئەی کۆمەڵی ئەنصار ئایا ڕازی نابن ، خەڵك بە مەڕو وشتر بڕوات و ، ئێوەش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان ؟؟

بەوەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر لەبەر کۆچ کردن نەبوایە من دەبووم بە یەکێك لە ئەنصارەکان .. ئەگەر خەڵك ڕێگایەکیان بگرتایە ، من ڕێگای ئەنصارم دەگرتە بەر پەروەردگارا ڕەحم بە ئەنصارو نەوەی ئەنصارو ، منداڵی ئەنصار بکە ... } !!

لێرەدا ئەنصارەکان ئەوەندە گریان تاکو ڕیشیان تەربوو ...

وتە شیرینەکانی پێغەمبەری مەزن ﷺ و بەڕێز هێمنی و دەوڵەمەندی و خۆشی خستە ناو دڵیانەوە ...

هەموو هاواریان کرد لەگەڵ ( سەعدی کوڕی عوبادە )ش :-

{ بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازین بووین بە بەش و بە قسمەتمان ... }

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، ئەنصارەکان کۆبوونەوە لەژێر کەپری ( بەنی ساعدە ) خۆیان بەشیاو زانی بن بە خەلیفەی پێغەمبەری

خوا ﷺ ، ئەوەبوو چوون بۆ لای ( سەعدی کوڕی عوبادە ) کەوا یەکەم خاوەنی بیروڕایان بوو لەم کاتەدا ( سەعد ) لەسە رجێگا کەوتبوو ، خۆی نەیتوانی قسەیان لەگەڵ بکات کوڕەکەی بۆ ناردن ، کوڕەکەی پاش حەمدو ستایش ، گەورەیی و چاکەخوازی و پشتیوانی خۆیان بۆ ئیسلام بەیاد خەڵکەکە هێنایەوە ...

لەم کاتەدا ( ئیمامی ئەبوبەکر و ئەبوعوبەیدە ) ئامادە بوون لەگەڵ هەندێك لە موهاجیرەکان گوێیان دا قسەکانی ( سەعد ) بە هەندێك قسە وەڵامی دانەوە :- کەوا یەکەم جار دانی نا بە گەورەیی و منەتی ئەنصارەکان بەسەر ئیسلام ، بەڵام پاشان بە چەند بەڵگەیەکی پڕشنگدار سەلماندی ئەم ئالایە جێگای خۆیەتی موهاجیر هەڵیبگرن ، خەڵکەکە هەموو قەناعەتیان هێنا بە ( موهاجیروئەنصار ) تەنها ( سەعدی کوڕی عوبادە ) نەبێت موبایەعەی بە ( ئیمامی ئەبوبەکر ) نەدا ، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو خەڵکەکە موبایەعەیان کرد ئەویش نەبووە بەرپەرچ بەرامبەری و لە ڕۆژانی خەلافەتی بە هیچ جۆرێك ( ئیمامی ئەبوبەکر )ی تووڕە نەکرد ...

لە ڕۆژانی خەلافەتی ( ئیمامی عومەر ) ڕۆژێك ( سەعد ) لە ڕێگای مەدینە پێی گەیشت ...

( ئیمامی عومەر ) گوتی :- ها ئەی ( سەعد ) !

( سەعد ) گوتی :- ها ئەی عومەر !

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :- تۆ خاوەنی ئەو شتەیت کەوا لەگەڵتایە ؟

سەعد گوتی :-

بەڵێ مـن وام ، بەڕاستی ئەم خەلیفایەتیەی گەیشتە تۆ ، سوێند بەخوا هاوڕێیەکەت ( ئیمامی ئەبوبەکر ) لە ئێمە خۆشەویستر بوو ، سوێند بەخوا ناتوانم ئێستا جیرانەتی تۆ بکەم ...

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :-

یەکێك حەز بە جیرانەتی یەکێك نەکات دەیگوازێتەوە ، من دەگوازمەوە بۆ جیرانەتی یەکێك لە تۆ چاکترە ، واتە خوای گەورەو گەیشتنی بە مردن .

لێرەدا ( سەعدی کوڕی عوبادە ) – خوا لێی ڕازی بێت – ترسا لەوەی لە مەدینە بمێنێتەوە کێشەیەك دروست بێت لەگەڵ ( ئیمامی عومەر ) ، حەزی نەدەکرد پەرتەوازەیی دروست بێت پاش ئەوەی یەك ڕیزی موسڵمانان دروست بووبوو ، لەبەر ئەوە باری تێك ناو ڕووی کردە شام ، لە خاکی ( حوران ) نیشتەجێ بوو ، پاش دوو ساڵ و نیو بەسەر خەلافەتی ( ئیمامی عومەر ) – خوا لە هەموان ڕازی بێت – بارگەی گواستەوە و گەیشت بە باشترین جیران بە پەروەردگاری جیهان ...

لە دواییدا دەڵێین پەروەردگارا دڵێکی صاف وبێ گەرد ، وەکو دڵە ڕاست و ڕوونەکەی ( سەعد ) کە خاڵی بوو لە ( حیقد ) و دووڕوویی و ڕق لێ بوونەوە لە موسڵمانان ببەخشێ پێمان ، لە ڕۆژی دواییش بەم یاوەرە بەهەشتیانە شادمان بکەیت ...

* * *

٦٩

# سەعیدی کوڕی عامر

## قوتابیەکی دەرچووی زانکۆی موحەممەد ﷺ

# {٦٩}

# ﴿ سەعیدی کوڕی عامر ﴾

# قوتابیەکی دەرچووی زانکۆی موحەممەد ( ﷺ )

کێ هەیە لە ئێمە ئەو پیاوە بناسێت‌و ، کێ هەیە تاکو ئێستا گوێی لەم ناوە بوو بێت ....!؟

زۆربەی گومانەکان وا دەگەیەنێن زۆربەمان ، واتە بەشێك نابینیتەوە بە هیچ جۆرێك گوێ بیستی ئەم پیاوە بن ، ئێمەش هەروەکو ئێوە بەدوای ئەمە دادەچین‌و پرسیار دەکەین :- دەبێت ئەم ( سەعیدی کوڕی عامر )ە کێ بێت ....؟؟

بەڵێ ... ئێستا دەزانین - پاش چەند ساتێك - ئەم بەختەوەرە کێیە ....!!

ئەم یاوەرە یەکێکە لە دەرچووانی زانکۆی پێغەمبەر ﷺ و یەکێکە لە یاوەرە هەرە گەورەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەرچەندە ناوی ئەم بەڕێزە نازرینگێتەوە لەنێو ناوە گەورە یاوەرەکان .....

ئەمە یەکێکە لە گەورە خواپەرستە شاراوەکان ... !!

ئەم یاوەرەش هەروەکو یاوەرانی تر بەشداری هەموو دیمانەو جەنگەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە ، ئەمەش پیشەی هەموو موسڵمانان بووە ، بڕوادراێك نەبووە نە لەکاتی شەڕو نە لەکاتی ئاشتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوا بکەوێت

( سەعید ) لە پێش فەتحی خەیبەر موسڵمان بوو ، هەر لەم ڕۆژەی باوەشی کرد بە ئیسلام و موبایەعەی‌دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەموو چارەنووس‌و بوون‌و ژیانی خۆی بەخشی بە ئیسلام

هەموو سیفەت‌و ڕەوشتە بەرزەکانت لەم یاوەرە دەدۆزیەوە .... وێنەی :-

خواپەرستی و زوهدو ، مل کەچی‌و ، وازهێنان لە دونیا

هەروەها کاتێك بمانەوێت بکەین بەم یاوەرە یاخود ژیاننامەی بخوێنینەوە ، پێویستە لەسەرمان هیچ سیفەتێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئەم پیاوە لەیاد نەکەین و لە دەستمان نەچێت ...

کاتێکیش دیقەت دەکەینە سەر ( سەعید ) لە قەڵەباڵغیەك ، هیچ شتێك نابینین ببێتە هۆی جێگای تێبینی و هێمایەکی تایبەتی بۆ دابنێین ... بەڵکو ئەم پیاوە وەکو موجاهیدێکی ئاسایی لە لەشکری موسڵمانان یان کۆمەڵی موسڵمانان دەیبینینەوە یاخود پیاوێکی لەش تۆزاوی و قژ تێکەڵ بوو ، هیچ شتێك لە جل‌وبەرگی و شێوەی دەرەوە لە موسڵمانە هەژارەکان جیای ناکاتەوە ....!!

ئەگەر بمانەوێت لە جل‌وبەرگ‌و شێوەی دەرەوەی ڕاستی ئەم یاوەرە بزانین ، کەواتە هیچ شتێکمان نەبینیووە ، ڕەسەنی و مەزنی ئەم پیاوە زیاتر لە کەسایەتیەکەی بەدیار دەکەوێت نەك لە شێوەی دەرەوە ...

ئەم پیاوە زێڕێکی وون بووەو ، هەروەکو مرواری خۆی لە ژێر سەدەفی ئەم گیانەوەرە شاردۆتەوە ...؟ ئەمەش باشترین نموونەیە بۆ ئەم پیاوەو ، لەمە زیاتر هیچی‌تر نالێین ..

*                    *                    *

کاتێك ئەمیری بڕوادارن ( عومەری کوڕی خطاب ) – خوا لێ‌ی ڕازی بێت – ( معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان )ی لەسەر کار لابرد لە وڵاتی شام ، ئاوڕی لە دەوروپشتی خۆی دەدایەوەو دەگەڕا لە یەکێك لە شوێنی ( معاویە )ی دابمەزرێنێت و دایبنێت

چۆنیەتی هەڵبژاردنی فەرمانڕەوا لە لایەن ( ئیمامی عومەر ) ڕۆحمان بە قوربانی بێت – ڕێبازێك بوو هەموو مەبەستە مەزنەکانی ووردبینی‌و ئاگاداری‌و دووربینی تیا کۆدەبووەوە ... لەبەر ئەوەی ئەم خەلیفەیە وای دەڕوانی هەر هەڵەیەك فەرمانڕەوایەك لە فەرمانڕەواکانی بکەوێتە ناویەوە ، لە هەر شوێنێك بێت لەسەر زەوی ، خودای گەورە لە دوو کەسان دەپرسێتەوە :– یەکەمیان ( ئیمامی عومەر ) دووەمیان خاوەن هەڵەکە

بەم جۆرە کێشانەی خەڵك لە لایەن ( ئیمامی عومەر ) ووردبین‌و دووربین بوو زیاتر لە ئاستی بینایی چاو ....

وڵاتی شام لەم ڕۆژگارەدا ئاوەدانی‌یەکی گەورەی تیابوو ، ژیان تیایدا پێش هاتنی ئیسلام بە چەند سەدەیك هەموو شارستانیەتە بازرگانیەکانی تیا دەسوڕایەوە بنکەی گرنگی بازرگانی بووو ، شوێنێکی فراوانی نیعمەت بوو ، لەبەر ئەم هۆیانە خانووی هەڵخەڵەتاندن بوو ، هەموو کەسێك بە بیروڕای ( ئیمامی عومەر ) شایەنی ئەم شوێنە نی‌یە ، تەنها خواپەرستێك نەبێت ، لەژێر چەخماخەی شەیتانەکان هەڵێت ، ئەمەش دەبێت گەڕاوە بێت بۆ خواو خواپەرست بێ‌و ، هەموو کات مل کەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بێت ...

( ئیمامی عومەر ) هاواری لێ‌هەڵدەستێ‌و دەڵێت ... بینیمەوە ، ( سەعیدی کوڕی عامر )م بۆ بانگ بکەن ... !!!

زۆری پێ‌نەچوو ، ( سەعید ) هات بۆ لای ئەمیری بڕواداران‌و فەرمانڕەوایەتی ( حمص )ی پێشنیار کرد ...

بەڵام ( سەعید ) بە ئاگاداری‌یەوە ... دەڵێت { بە هیلاکم مەدە ، ئەی ئەمیری بڕوادارن }

( ئیمامی عومەر ) هاوار دەکات‌و دەڵێت :

{ سوێند بەخوا ، وازت لێ‌ناهێنم ، خەلیفەیەتی‌و ڕاسپاردەکانتان دەهاوێنە ئەستۆی من‌و ، پاشان وازم لێ‌دەهێنن ... ؟؟ }

ساتێکی نەبرد سەعید ) قەناعەتی هێنا ، لەبەر ئەوەی ووشەکانی ( ئیمامی عومەر ) جێگای قەناعەت بوون

بەڵێ ... ئەمە ڕاست نی‌یە خەلیفایەتی و ڕاسپاردەکانتان بهاوێنە سەر ملی ئەو‌و پاشان بە تەنها بەجیّ‌ی بهێڵن

ئینجا ئەگەر نموونەی وەکو ( سەعیدی کوڕی عامر ) لە مەسئولیات‌و لێپرسراوەتی ڕادەکەن ، دەبێت چ جۆرە کەسێك یارمەتی ( ئیمامی عومەر ) بدات‌و ئەم فەرمانە گرانەی لەسەر سووك بكات ...

( سـەعید ) ڕۆیشـت بـۆ ( حمـص ) ، خێزانەکەشـی لەگـەڵ بـوو کـەوا تـازە گواستبویەوە ، ئـەم خێزانەشـی بـەدڵی خـۆی هێنـا بـوو ، پـەیوەندی خێزانـەتیان زۆر بەتین بوو ..

کاتێك هەردووکیان لە ( حمص ) جێگیر بوون ، خێزانەکەی ویستی ( سەعید ) مافی خێزانیـەتی بداتـێ لـە بـەکارهێنانی هـەندێك مـاڵ کـەوا ( ئیمـامی عومـەر ) پـێ‌ی بەخشیبوون ، بە ( سەعید )ی گـوت کـەوا هـەندێك جل‌وبـەرگ‌و پێویسـتی‌و کەل‌وپـەل بکڕێت ، پارەکەی ماوە کۆی بکاتەوە ...

( سەعید ) بە خێزانەکەی گوت :-

ئایا ڕێگایەکی چاکترت پێ‌نیشان بدەم لەمە ... ؟؟

ئێمە لە وڵاتێکی قازانج بە بازرگانی دەژین ، بازاڕەکانی گەرمن ، با ئەم پارەیە بدەین بە یەکێك بازرگانیمان بۆ بکات و قازانجمان بداتێ ...

خێزانەکەی گوتی :-

ئەگەر لە بازرگانیەکە زەرەرمان کرد ... ؟

سەعید گوتی :-

من دەبم بە دابینکاری ئەم کارە ... !!

( سەعید ) ڕۆیشت هەندێك پێویستی ڕۆژانـەی کـڕی ، پاشـان ئـەم ماڵـەی مایـەوە دابەشی کرد بەسەر هەژاران ...

چەند ڕۆژێك بەسەردا ڕۆیشت خێزانەکەی پرسیاری بازرگانیەکـەی لـێ‌دەکرد بزانـێ چەندیان قازانج کردووە ...

( سەعید ) بەم وتانە وەڵامی دایەوە :-

بەڕاستی بازرگانیەکی سەرکەوتووەو ... قازانجەکە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیاد بووندایە ...

ڕۆژێك لە ڕۆژان هەمان پرسیار دەکات لە نزیکێکیان ، ڕاستی ئـەم کارەی دەزانی‌و زەردەخـەنی بـردەوە ، پاشـان بـە جۆرێکـی وا شـك‌و گومـانی خسـتە دڵـی ئـەم ئافرەتـە ، ئـەویش ئیلحـاحی لـێ‌دەکرد ڕاسـتی ئـەم قسـەی پـێ بڵێـت ، ئـەویش پێ‌ی گوت :-

هەر لەم ڕۆژەوە ، ماڵەکەی هەموو بەخشی

خێزانی ( سەعید ) دەستی کرد بە گریـان ، ئاخی بۆ ئەوە هەڵدەکێشا لەبەر ئەوەی سوودی لە پارەکە نەبینی و شتێکی بۆ خۆی پێ نەکڕی‌و ، ماڵەکەی ڕۆیشت ....

پێش ئەوەی ئەم دیمەنە شتێك لە دڵی خێزانەكەی دروست بكات ، بیروهۆشی خۆی گواستەوە بۆ لای ئەم هاوڕێیانەی پێشووی‌و ، گوتی :-

{ چەند هاوڕێیەكم هەبوو پێشی من گەیشتن بە خوا  منیش حەز ناكەم لە ڕێگای ئەوان لابدەم ئەگەر هەموو ئەوەی لە دونیا هەیە بۆ من بێت }

بەم جۆرە دڵی خێزانەكەشی هێمن‌و ئارام بووەوە ، زانی هیچ شتێك چاكتر نییە لەم ڕێگایەی ( سەعید ) گرتوویتە بەر ....

ئەوەندەی پێنەچوو تاكو هەندێك لەم كەسانەی ئەمیری بڕواداران متمانەی پێدەكردن لە خەڵكی ( حمص ) هاتن بۆ لای ( ئیمامی عومەر ) ، ( ئیمامی عومەر ) پێی گوتن :-

ناوی ئەم هەژارانەی خۆتانم بۆ بنووسن تاكو پێویستییەكانیان بۆ تەواو بكەم ، نامەیەكیان بۆ بەرز كردەوە گوتیان :

فلان‌و فلان و ( سەعیدی كوڕی عامر ) ، گوتی :-

( سەعیدی كوڕی عامر ) كێیە ؟! گوتیان :- ئەمیرمان .

گوتی :- ئەمیری ئێوە هەژارە ؟!

گوتیان :- بەڵێ . سوێند بە خوا چەند ڕۆژێك دێ‌و دەڕوا ئاگر لەماڵیان ناكرێتەوە ، ( ئیمامی عومەر ) ئەوەندە گریا تاكو ڕیشی بە فرمێسكەكانی تەڕ بوو ، پاشان هەزار دیناری بۆ لەناو دەستەسڕێك پێچایەوەو گوتی :-

سەلامی منی پێڕابگەیەنن‌و پێی بڵێن :-

ئەم پارەیە ئەمیری بڕواداران بۆی ڕەوانە كردوویت ، بۆ ئەوەی پێویستییەكانی خۆتی بۆ جێبەجێ بكەیت ....نوێنەرەكە لەگەڵ دەستەسڕەكەی هاتە لای ( سەعید ) تەماشای كرد بینی پارەیە ، ئەوەبوو لەخۆی دووری خستەوەو دەیگوت :-

﴿ انـا للّـه وانـّا اليـه راجعون ... ﴾ ، هەروەكو بڵێیت هێرشێكی دوژمنی كرابێتە سەر یاخود تووشی كارەساتێك بوو بێت خێزانەكەی بە مشەوەشی ترس‌و لەرزەوە چوو بۆ لای‌و گوتی :-

چیت لێڕوداوە ئەی ( سەعید ) ؟! ئایا ئەمیری بڕواداران مردووە ؟! گوتی :-

بەڵكو گەورەتر لەمە . گوتی :-

ئایا موسڵمانان تووشی كارەساتێك بوون ؟ گوتی :-

لەمەش گەورەتر ، گوتی چییە لەمە گەورەترە ؟!

( سەعید ) گوتی :-

دونیام لێهاتۆتە ژوورەوە بۆ ئەوەی ڕۆژی دواییم لێتێك بدات ، ( فیتنە ) هاتۆتە ناو ماڵم .

خێزانەكەی گوتی :-

خۆتی لێ ڕزگار بكە - ( لە بارەی ئەم پارەیە هیچی نەدەزانی ) .

( سەعید ) گوتی :-

ئایا یارمەتیم دەدەی لەسەر ئەمە ؟ ئەویش گوتی :-

بەڵێ ، دینارەکانی وەرگرت لەناو دەستەسڕێك پاشان دابەشی کرد بەسەر هەژارە موسڵمانەکان ...

( حمص ) لەم ڕۆژگارەدا وا ناویان دەهێنا کەوا ( کوفەی دووەمە ) بەهۆی زۆری هەڵگەڕانەوەی خەڵکەکەی و ناکۆکی یان لەگەڵ دەسەڵاتدارەکانیان

لەگەڵ ئەوەی خەڵکی ( حمص ) زۆر پەرۆشی هەڵگەڕانەوە بوون ، خودای گەورە دڵی هیدایەت دابوون بۆ بەندەی پیاوچاك (سەعید ) ، خۆشیان دەویست و گوێڕایەڵیشیان دەکرد

ڕۆژێك ( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :- خەڵکی شام تۆیان خۆش دەوێت ؟

( سەعید ) وەڵامی دایەوە و گوتی :-

لەبەر ئەوەی من یارمەتیان دەدەم و جیاوازیان لە نێوان ناکەم .

هەرچەندە خەڵکی ( حمص ) ( سەعید )یان خۆش دەویست ، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت هەندێك سکالاو بێزاری یان هەبێت ... بۆ ئەوەی بیسەلمێنن ( حمص ) پێشبڕکێ یەکی بەهێز دەکات لەگەڵ ( کوفە )ی عێراق ....

ڕۆژێکیان ئەمیری بڕواداران ( ئیمامی عومەر ) سەردانی (حمص ) دەکات و لە قەڵەباڵغیەکی گەورە پرسیار لە خەڵکەکە دەکات :-

چی دەربارەی ( سەعید ) دەڵێن ... ؟؟

هەندێکیان هاتنە پێشەوە بۆ سکالا ... سکالاکانیان پڕ بوو ، زۆر لە لایەنی مەزنی ئەم پیاوە بەدیارکەوت ، بە جۆرێکی زۆر سەرسوڕهێنەر .... !!!

( ئیمامی عومەر ) داوای لە سکالاچی یەکان کرد خاڵەکانی سکالایان بۆ بژمێرن ، یەکە بە یەکە ....

یەکێك لە قسەکەرەکان بە ناوی ئەم کۆمەڵە هەڵساو ، گوتی :-

ئێمە سکالای ئەم چوار خاڵەی لێدەکەین ..

- نایەتە لامان تا ڕۆژ نەیەتە دەرەوە ..

- بە شەو وەڵامی کەس ناداتەوە

- دوو ڕۆژی هەیە لە مانگێك نە لێمان دێتە دەرەوە و نە دەیبینین .

- شتێکی تر چاری نی یە ، بەلام بێزاری کردووین ، ئەویش ئەوەیە دەبوورێتەوە ، واتە جارجار لەهۆش خۆ دەچێت ...

ماوەیەك ( ئیمامی عومەر ) داماو ، پاشان لە خوا پاڕایەوە بە بێ ئەوەی دەنگی لێبێتە دەرەوە و گوتی :-

{ پەروەردگارا من دەیناسم لە باشترین بەندەکانتە ... پەروەردگارا ئەم فیراسەتەی لێی چاوەڕوان دەکەم بێتە جێ ... }

( ئیمامی عومەر ) بانگی ( سەعید )ی کرد بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات ...

( سەعید ) گوتی سەبارەت بەم قسەیان

- نایەتە لامان تا ڕۆژ نەیەتە دەرەوە ...

سوێند بەخوا حەزم نەدەکرد هۆیەکەی ئاشکرا بکەم ... من خزمەتکارم نی‌یە ، خۆم هەویر دەشێلم ، پاشان وازی لێ‌دەهێنم تا دەترشێت ، پاشان دەیکەم بە نان پاشان دەست نوێژ دەشۆم بۆ چێشتەنوێژ ، ئینجا بۆیان دەردەچم .

سەبارەت بەم قسەشیان :-

– بە شەو وەڵامی کەس ناداتەوە

سوێند بە خوا حەزم نەدەکرد‌ئەوەشیان ئاشکرا بکەم ... من ڕۆژم بۆ ئەوان داناوەو ، شەویش بۆ پەروەردگار ...

سەبارەت بەم قسەشیان :-

دوو ڕۆژی هەیە لە مانگێك نە لێمان دێتە دەرەوەو نە دەیبینین .

خزمەتکارم نی‌یە جل‌و بەرگم بۆ بشوات ، جل‌و بەرگی زیاتریشم نی‌یە بیانگۆڕم ، خۆم جل‌وبەرگ دەشۆم پاشان چاوەڕێ دەکەم تا پاش ماوەیەك وشك دەبێتەوە ، پاشان لە دوای کاتێکی درەنگ بۆیان دەچمە دەرەوە

سەبارەت بەم قسەشیان :-

لەهۆش خۆچوون جارجار دەمگرێت :-

من دیمەنی لە سێدارەدانی خوبەیبی ئەنصاریم لە مەککە بینی قوڕەیش پارچە پارچە گۆشتیان لە لەشی دەکردەوە ، لەسەر یەکیان دادەنا لەسەر قەدی دارخورمایەك‌و، پێ‌یان دەگوت حەز دەکەیت موحەممەد ﷺ لە شوێنی تۆ بێت‌و ، تۆش ساغ‌و سەلامەت بیت ...؟

ئەویش وەڵامی دەدانەوەو دەیگوت :-

سوێند بەخوا من حەز ناکەم لەناو کەس‌وکارم و منداڵم بم ، لە خۆشی‌و سەڵتەنی دونیا بم‌و ، پێغەمبەری خواش ﷺ یەك دڕکی لە پێ‌ی ڕابچێت ...

هەر کاتێك ئەم دیمەنەی بینیم بە یادم دێتەوە ، من ئەم کاتە لە هاوبەش پەیداکەران بووم ، پاشان ئەوەم بەیاددا دێتەوە یارمەتی خوبەیبم نەدا لەم ڕۆژە ، لەرز دەمگرێ لە ترسی سزای خوا ، ئەم دیمەنە وام لێ‌دەکات لە هۆش‌ِخۆ بچم ....

بەڵێ هۆی سەرەکی ( سەعیدی کوڕی عامری جومحی ) هەر ئەمە بوو وای لێکرد ڕۆژی دوایی بە دونیای بکڕێت‌و ، ئەم دیمەنەی ( خوبەیب ) وای لێکرد ، بزانێت ژیانی دونیا تەنها بریتی‌یە لە خواپەرستی و جیهادکردن لە ڕێگای خوادا تا مردن ...

کاتێك ( ئیمامی عومەر ) گوێ‌ی لەم وەڵامانەی (سەعید ) بوو نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر دەروونی خۆی‌و ، لەخۆشیان هاواری کردو گوتی :-

{ سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم فیراسەتەی چاوەڕوانم دەکرد لێ‌ی هاتە جێ } .

دەستی لە ملی ( سەعید ) کردو ، نێوچەوانە نورانی‌یەکەی ماچ کرد

* * *

ئینجا دەبێت ئەم بەختەوەرە چ هیداتێك درابێ چ جۆرە مرۆڤێك بێت ....؟!

چ مامۆستایەك ئەم وانانەی دابێت ....؟!

دەرچووی چ زانکۆیەك بێت چ (عەمید )ێك سەرپەرشتی کردبێت ....؟!

لە چ پەنجەرەیەکەوە ئەم ڕوناکی‌یەی بەرکەوتبێت ؟!

ئێمەش لە وەڵام دا دەڵێین :-

ئەو مامۆستایەی ئەم وانانەی پێبەخشی موحەممەد بوو ﷺ ، دەرچووی زانکۆی هەمان مامۆستا بوو ، ئەم ڕوناکیەی وەردەگرت هەر هەمووی لە قورئان بوو ...

ئەگەر هاتوو زەوی ئەمڕۆکە ژمارەیەکی لەم جۆرە تیازە هەڵبگرێت و قبوولی بکات ، ئەوا ڕووی زەوی سەرتاپا دەبێت بە بەهەشتی فیردەوس و ئەم ئاشتی و دادوەری و ئازادی‌یەی خەڵکانی ئەمڕو داوای دەکەن ، لەم ڕۆژە بە تەواوی دەست دەکەوێت ، درۆیەکانی بەناو ئاشتی ویستەکان وەکو مانگی چواردە بەدیار دەکەوێت

ڕۆژێك بە ( سەعید )یان گوت :-

{ ئەم ماڵە زیادە بەسەر کەس‌وکارو خزمەکانت دابەش بکە ؟ }

بەم جۆرە وەڵامی دانەوەو گوتی :-

{ بۆچی کەس‌وکارو خزمەکانم ... ؟؟ }

{ نەخێر سوێند بەخوا ، من ڕەزامەندی خوا نافرۆشم بە خزمایەتی }

زۆر جار ( سەعید ) ئەم ووشە مەزنانەی دووبارە دەکردەوە :-

{ من لە دەستەی یەکەمینی بڕواداران دواناکەوم ، پاش ئەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو :-

خوای گەورە ڕۆژی دوایی خەڵك کۆدەکاتەوە ، هەژاری بڕوادارەکان دەهێنن ، بە کۆمەڵ دێن هەروەکو ڕەوەی کۆتر ، پێیان دەڵێن :-

بوەستن بۆ لێپرسینەوە ، ئەوانیش دەڵێن :-

هیچ شتێکمان لەسەر نی‌یە لێپرسینەوەمان بۆ ئەنجام بدەن خودای گەورە دەفەرموێت :-

{ بەندەی من ڕاستی کرد .... پێش خەڵك دەچن بۆ بەهەشت } .

لە ساڵی ( بیستی ) کۆچی ، (سەعید ) بارگەی گواستەوە بۆ لای پەروەردگارو ئەوەبوو باشترین و جوانترین ژیاننامەی لە دوای خۆی جێهێشت ..

گەیشت بە کاروانی یەکەم کەوا زۆربەگەیشتنیان بە پەرۆش بوو ، بە گوێرەی چاو تروکانێك لە ڕێبازی ئەوان لای نەدا

سەلامی خودا لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەموو یاوەرە پاکەکانی کەوا ژیانی دونیایان فرۆشت لە پێناوی ڕۆژی دوایی و ، گەیشتن بە پەروەردگار و خرانە بەهەشتە فراوانەکان و لە لایەن فریشتەکانی خوا پێشوازی‌یان لێکراو پێیان گوترا :-

﴿ ان تلكم الجنة ، أورثتموها بما كنتم تعملون ﴾ .

* * *

٧

# خەبابی کوڕی ئەڕەت

## مامۆستای هونەری
## خۆبەقوربانی‌دان

## {٧٠}

# ﴿ خەبابی کوڕی ئەرەت ﴾
# مامۆستای هونەری خۆبە قوربانیدان

زۆرن ئەوانەی لە ڕێگەی خودا بە دەستی دوژمنانی خوا ئازارو ئەشکەنجە دران بەڵام هەر کەسێك بە جۆرێك ئازار درا ( بیلال ) لە چرقەی گەرما بەردی سووربووەی بیابانی مەککەیان لەسەر سنگی دادەناو ( سومەیەو یاسر ) یەکسەر شەهید کران ، هەرچی موسڵمانانی تر بوون بە جۆرەها ئازار ، ئازار دەدران کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام داوای لێدەکردن ئارام بگرن ، بەڵام با بزانین ئەم ئارامو خۆڕاگرییە تا کەی بەردەوام دەبێتو ئەنجامەکەی بەچی دەگات !!!

( خەبباب ) یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لەم ( شەش ) کەسە یاخود ( حەوت ) کەسەی لە سەرەتا ، پێش ئەوەی بچن بۆ ماڵی ( ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم ) موسڵمان بوون ، هەروەکو ( موجاهید ) دەڵێت :-

{ یەکەم جار کە ئیسلامیان ئاشکرا کرد ( حەوت ) کەس بوون :-
پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئیمامی ئەبوبەکر ، بیلال ، خەبباب ، صهیب ، عەممار ، سومەییە }

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ، زۆربەی ئەوانەی ئیسلامیان لە پێش خەڵك وەرگرت زۆربەیان چەوساوەو بەندە بوون ، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتدارو طاغوتانی ئەم سەردەمە مافی مرۆڤایەتی ئەوانەیان پێشێل کردبوو لە ژێر نیری کۆیلەو بەندایەتی

ئینجا با بزانین ( خەبباب )ی بەندەو کۆیلە کێبوو ؟ چۆن ئازارو‌ئەشکەنجە دەدرا بە دەستی گەورەکانیو کاتێ بوو بە موسڵمان چ پلەو پایەکی وەرگرت :-

( خەبباب کوڕی ئەرت کوڕی جەندە کوڕی سەعد کوڕی خوزەیمە کوڕی کەعب کوڕی بەنی سەعد کوڕی زەید مناة کوڕی تەمیم ) .

نازناوی : باوکی ( عبدالله ) بوو .

هەر لە منداڵیەوە بە دیل گیراو ، لەگەڵ منداڵە دەست بەسەرگیراوەکان لە مەککە فرۆشرا ، ئافرەتێك بەناوی ( أم انمار ) کڕییەوە ، دایکی ( أم سباع ی خزاعیە ) بوو کەوا ( سونەتکەر ) بوو لە مەککە ، کاتێك لە جەنگی ( ئوحد ) کەوتە بەرامبەر گەورەمان ( حەمزەی کوڕی عبدالمطلب ) - خوا لێی ڕازی بێت - ، بەم ناوە بانگی کرد :-

وەرە بۆ لام ئەی کوڕی سونەتکەر ...

ئەوەبوو بە دەستی ( حەمزە ) کوژراو ڕەوانەی دۆزەخ کرا ...

لەسەر ئەمە ( خەبباب ) گەورە بوو لە مەککە ، هاوپەیمانی ( بەنی زهرة ) بوو کاری دەکرد لە کاری ئاسنگەری ، بەناوبانگ بوو بە وەستای شمشێر ...

چەند کەسێك لە قورەیشیەکان ، لە ماڵەوە بەڕێکەوتن بە نیازی ڕۆیشتن بۆ ماڵی ( خەبباب ) بۆ ئەوەی ئەو شمشێرانە وەرگرنەوە کەوا ڕێککەوتبوون لەسەر دروست کردنی ... لەبەر ئەوەی ( خەبباب ) عادەتی وابوو لە ماڵەوە دەرنەدەچوو لەبەر کارکردن ، بەڵام ئەمجارەیان کاتێك چەند نەفەرێك لە قورەیشیەکان چوون بۆ ماڵی ، لە ماڵەوە نەبوو ، لەبەر دانیشتن و چاوەڕێیان کرد

ماوەیەکی زۆری پێچوو ( خەبباب ) پەیدابوو نیشانەی پرسیاری ڕوون لەسەر نێوچەوانی دیاربوو ، هەروەها فرمێسکی خۆشیش لەسەر چاوی دیار بوو ، ئەوەبوو بەخێرهاتنی میوانەکانی کردو دانیشت

به پەلە پرسیاریان لە ( خەبباب ) کرد ، ئایا شمشێرەکانت بۆ تەواو کردووین ؟؟

پاش ئەوەی فرمێسکەکانی وشك بووەوە ، لەنێوچەوانی کەیف خۆشی بەدیار کەوت ، ( خەبباب ) لەبەر خۆیەوە – هەروەکو بڵێیت قسە لەگەڵ دەروونی خۆی دەکات – بە ڕاستی کارەکەی سەرسوڕهێنەرە ... !!!!!

کۆمەڵەکە پرسیاریان لێکرد : چ کارێك ...؟؟ پرسیاری شمشێرەکانمان لێدەکەین ؟ ئایا تەواوت کردووە ؟؟

( خەبباب ) وەڵامی نەدانەوەو دەیگوت :-

– ئایا نەتانبینیووە ؟؟ وە ئایا گوێتان لە قسەکانی نەبووە .... ؟؟

کۆمەڵەکە تەماشای یەکتریان دەکرد بە سەرسوڕمانەوە ......

یەکێکیان بە گاڵتەوە پرسیاری لە ( خەبباب ) کردو گوتی :-

– ئایا تۆ نەتبینیووە ئەی ( خەبباب ) ... ؟؟

( خەبباب ) وەڵامی دایەوەو گوتی :-

ئەمە مانای چی‌یە ..... ؟

پیاوەکە بە توورەیی‌یەوە وەڵامی دایەوە :-

واتە ئەوەی پەیوەندی بە تۆ هەیە .... ؟؟

( خەبباب ) ئەمجارەیان بە ڕاشکاوی ( پاش ئەوەی هەنگاو بە هەنگاو بۆیان چوو بوو ) وەڵامی دانەوەو لە بەرامبەریان دانی هێنا بە موسڵمان بوونی و لەبەر ئەوەی هەق و ڕاستی بە چاوی خۆی بینیبوو باوەشی پیاکردبوو ، ئینجا بڕیاریدا بیروباوەڕی خۆی ئاشکرا بکات ..

لە کاتێکدا لە ئاسمانی خۆشی دەخولایەوەو باڵەفڕکێی خۆشی گرتبوو ، گوتی :-

– بەڵێ .... بینیم و گوێم لێ بوو .... بینیم هەق هەڵدەقوڵا لە هەموو لایەك و ، ڕوناکی لە نێو لێوەکانی دەبریسکایەوە .... !!!

– ئەمجارەیان بەکرێگیراوە قورەیشیەکان تێی گەیشتن ، یەکێکیان هاواری کرد :-

– ئەوە کێبوو قسەت لەگەڵ کرد ئەی بەندەی ( أم انمار ) .... ؟؟

( خەبباب ) بە هێمنی‌یەکی خواپەرستیانەوە گوتی :-

– جگە لەم کێ ؟ ئەی برای عەرەب جگە لەمەی نەتەوەکەت کێی تر ، هەق لە دەوروبەری هەڵدەقوڵێ و ، هەروەها ڕوناکی لەنێو لێوەکانی هەڵدەقوڵێ ...!!!

ئەوی تریان هاواری کردو ، پەلاماری دا :-

- وابزانم مەبەستت موحەممەده .

( خەبباب ) سەری بە خۆشی‌یەوه جولاندو ، گوتی :-

- بەڵێ ، ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ ئێمە ، بۆ ئەوەی دەرمانبهێنێت لە تاریکی‌یەوه بۆ روناکی ....

ئیتر ( خەبباب ) نەیزانی چی گوتووه چی‌یان پێ‌ی گوتووه ، پاش ئەم قسانەی پاش ئەوەی لە هۆش خۆ چووبوو ماوەی چەند کاتژمێرێك بەهۆش خۆ هاتەوه بینی میوانەکان نەماون‌و ، جەستەو ئێسکەکانی ئازار دەچێژن‌و ، خوێنە هاتووەکە لەش‌و جەستەی سوور کردووه !!

پاش بیرکردنەوەیەکی قووڵ ( خەبباب ) لە شوێنی کارکردنەکەی گەڕایەوه ماڵەوه ، برینەکانی تیمار کردو ، دووباره خۆی ئامادە کردەوه بۆ ئازارێکی تر .... !!

لەم ڕۆژەدا ( خەبباب ) جێگایەکی بەرزی گرت لە نێو موسڵمانە چەوساوەو ئازاردراوەکان‌و ... ئالای دەشەکایەوه لە ئاسۆی تۆقێنەری بت پەرستی و قەیسەریەکان ، مزگێنی‌دا بە جیهانی خودا دەبێت تەنها یەك خودا بپەرستێت‌و ، مزگێنی دا بە چەوساوەو زەحمەتکێشان کەوا بە یەکسانی دەوەستن لەگەڵ ئەوانەی خوێنیان دەمژین لەمەوپێش و جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەیان دەدان ...

ئیتر بە کۆڵنەدانێکی مەزن ، ( خەبباب ) بوو بە پێشەنگی ئازاردراوەکان ...

هەروەك ( الشعبی ) دەڵێت :-

{ بەڕاستی ( خەبباب ) ئارامی گرت‌و بە هیچ رێگایەك لە ژێر دەستی گاوران نەرمی نەنواند ، بەردی سووره کراوەیان بە پشتە رووتەکەی وه دەنووساند تاکو گۆشتەکەی دەتواوه } .

بەڵێ ... بەشی ( خەبباب ) لە ئازاردان یەکجار زۆر بوو ، بەڵام بەرگری‌و خۆگرتنی ( خەبباب ) لە ئازار گەورەتر بوو

گاوره قورەیشیەکان هەموو ئەم بەردو ئاسنانەی بۆ سوورکردنەوەو دروست کردنی شمشێر بەکاری دەهێنا ، دەیانکرد بە زنجیر لە جەستەی ( خەبباب )یان دەئالاند ، پاش ئەوەی بە ئاگر گەرمیان دەکردو سوور دەبووەوه ، ئینجا دەست‌و جەستەو پێ‌یەکانیان پێ دەبەستایەوه ...

ڕۆژێك لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێ چەوساوەکانی دەچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ نەك لەبەر ئەوەی ئارامیان نەماوه لەسەر خۆ بە قوربانی‌دان ، بەڵکو بۆ ئەوەی دوعای ساغ‌و سەلامەتیان بۆ بکات ، گوتیان :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ... ئایا دوعای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت ؟؟

با ئەم بەسەرهاتە بۆ خودی ( خەبباب ) لێ‌گەڕێن بزانین چی دەڵێت ...

{ سکالامان بردەی لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا لەسەر عەباکەی لە سێبەری کەعبە پاڵی دابۆوه ، گوتمان :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئایا داوای سەرکەوتمان بۆ ناکەیت ....؟؟

(( پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت ، دەموچاوی سوور بووەو فەرمووی :-
لەپێش ئێوە پیاوەکانیان دەهێنان ، زەوییان بۆ هەڵدەکەندن ، پاشان مشاریان بۆ دەهێنان ، لەسەر تەوقەی سەریان دادەنان ، وازیان لە ئایینەکەیان خۆیان نەدەهێنا ....!!!
هەروەها شانەی ئاسنیان دەهێنا بە لەشیان گۆشتیان لە ئێسقانەکانیان جیا دەکردەوە ، وازیان لە ئایینەکەیان نەدەهێنا !!
خودا ئەم کارە تەواو دەکات تا ڕێبوار لە ( صفاء ) دەچێت بۆ ( حضرموت ) لە کەس ناترسێت تەنها خودا نەبێت ، گورگیش لەسەر مەڕەکانی ، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن )) .
( خەبباب ) و هاوڕێکانی گوێیان لەم فەرموودەیە بوو ، بڕواییان زیاتر بەتین بووو ، وورەیان بەرزتر بووو ، بڕیاریان دا زیاتر خواو پێغەمبەریان خۆش بوویێت و لە نەخشەکێشان و ئارامگرتن و خۆ بە قوربانی دان ....
( خەبباب ) بەم جۆرە بەشداری جەنگی کارەساتەکانی کرد بە ئارامگری و خۆگری و داوای پاداشت لە خودا .... قوڕەیشییەکان پەنایان برد بۆ ( أم انمار ) گەورەی ( خەبباب ) کەوا پێش ئەوەی ئازاد بدرێت بەندەی ئەو بوو ، ئەمیش بەشداری ئازاردانی ( خەبباب )ی کرد ...
ئەوەبوو ئاسنی سوورکراوەی گەرمی دەهێناو ، لەسەر سەرو نێوچەوانی دادەنا ، ( خەبباب ) لە ژێر ئازارەکان دەتوایەوە ، بەڵام هەناسەکانی ئازاری قووت دەدایەوە ، تاکو بە ئاخ هەڵکێشان دڵی جەلادەکانی خۆش نەبێت ... !!
پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك بەلایدا تێپەڕی و ، ئاسنی سوورکراوە گۆشتی سەری دەکزاندەوە ، دڵی بەزەیی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ( خەبباب ) باڵی گرت ، بەڵام ئەم ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بۆ نەکرا بۆ ( خەبباب ) .... !؟
ئەو کاتە باشترین چەکی دەستی دوعاکردن بوو ....
لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستە پیرۆزەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو فەرمووی :-
{ اللّهـم انصـر خبـابـاً } ...
واتە :- پەروەردگارا ( خەبباب ) سەربخە .
حەزی خوای گەورە وابوو تەنها چەند ڕۆژێکی کەمی پێچوو ، تاکو تۆڵەی بەپەلە بۆ ( أم انمار ) دابەزی هەروەکو بڵێیت قەدەر ئاگاداری ئەمو ، هەموو ئەم جەلادانەی ...... کەوا ئێستاکە لە بەندیخانەکان ئازاری موسڵمانان دەدەن ، ئەمەش تووشی کۆخەیەکی سەیر بوو - هەروەکو مێژوو نووسەکان دەڵێن - هەروەك سەگ دەلوورایەوە ...
لەم ڕۆژگارە حەکیمەکان پێیان گوت :-
چارەسەریت نییە تەنها بە سەر داغکردن دەبێت .... !!
بەم جۆرە هەموو ئێوارەو بەیانیان دەبوایە بە ئاسنی سوورکراوە سەری داغ بکەن ... !!

قورەیشیەکان ئەم کاتە بە ئازاردان بەرگریان لە خۆیان دەکرد ، موسڵمانانیش بەرگری ئەم ئازارەیان دەکرد بە قوربانیدان ....

( خەبباب ) - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت :

- من پیاوێکی ئاسنگەر بووم و ، قەرزم لەسەر ( عاص کوڕی وائل ) بوو - باوکی عەمرو کوڕی عاص - چوومە لای داوای قەرزم کردەوە ، پێی گوتم :-

- قەرزەکەت نادەمەوە تا کوفر بە ( موحەممەد ) نەکەیت ...

( خەبباب ) دەڵێت پێم گوت :-

کوفری پێناکەم تا دەمری و پاشان زیندوو دەکرێیتەوە .

( عـــاص ) گوتی :-

من ئەگەر زیندوو بوومەوە لەپاش مردن ئینجا قەرزەکەت دەدەمەوە ئەگەر گەڕامەوە لای ماڵ و منداڵم .

ئەم ئایەتە قورئانییە هاتە خوارەوە :-

﴿ أفرأيت الّذى كفر بآياتنا و قال لأوتينّ مالاً وولدا ، أطلعَ الغيبَ أم اتّخذ عندَ الرّحمنِ عَهدا ، كلا سنَكتُبُ ما يقول و نمدُّ له من العذاب مدّا ، ونرثه ما يقول و يأتينا فَردا ﴾ سوره مريم (٧٧، ٧٨، ٧٩ )

( خەبباب ) - خوا لێی ڕازی بێت - لە ڕۆژگارەکانی سەرەتای بانگەێژیدا تەنها وازی نەهێنا بە خواپەرستی و نوێژ ، بەڵکو توانای خۆی بەکار هێنا لە فێربوونیش ، ئەوەبوو بە نهێنی دەچووە ماڵە بڕوادارەکان کەوا بە نهێنی موسڵمان بووبوون ، لە ترسی ئازاری قورەیش قورئانی بۆ دەخوێندنەوەو فێری ئایینی دەکردن .

هەروەك لە ماڵەوە قورئانی بە ( سەعیدی کوڕی زەیدو خێزانەکەی فاطمەی کچی خطاب ) دەگوت ، لە کاتێکدا ( ئیمامی عومەر ) پێش موسڵمان بوونی لێیان چووە ژوورەوە ، کاتێك ( خەبباب ) هەست بە هاتنە ژوورەوەی ( ئیمامی عومەر )ی کرد . خۆی لە سوچێکی ماڵەکە حەشاردا ، بەڵام پاش چەند دەمەقاڵێ و گفتوگۆیەك هیدایەتی خوا بۆ ( ئیمامی عومەر ) هاتە خوارەوەو دڵی نەرم بوو ، ئەوەبوو ( خەبباب ) خۆی ئاشکرا کردو هاواری کرد :-

{ ئەی عومەر سوێند بە خوا تکام وایە دوعاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرتۆ بێتە جێ ، کاتێك دەیفەرموو :

(( پەروەردگارا ئیسلام بەهێز بکەی بە ( عومەری کوڕی خطاب ، یان عەمرو کوڕی هشام ) .

( ئیمامی عومەر ) یەکسەر گوتی :-

ئێستاکە پێغەمبەر ﷺ لە کوێ دەدۆزمەوە ئەی ( خەبباب ) .... ؟!

( خەبباب ) وەڵامی دایەوە گوتی :-

لە ( صـــەفا ) ، لە ماڵی ( ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم )

ئیتر ( عومەری کوڕی خطاب ) - خوا لێی ڕازی بێت - ڕۆیشت بۆ بەختی وەفاداری و چارەنووسە مەزنەکەی .... !!!

( ابو ليلى الكندى ) دەگێڕێتەوە دەڵێت :-

- ( خەبباب ) هاتە لای ( ئیمامی عومەر ) ، ئیمام پیّی گوت :-
- نزیك بەرەوە ئەی ( خەبباب ) کەس لە تۆ شایەن تر نی‌یە لەم مەجلیسە تەنها ( عەماری کوڕی یاسر ) نەبیّت ، ئیتر ( خەبباب ) شویّنەواری ئازاری بێباوەڕەکانی لەسەر پشتی خۆی نیشان دا

پاش ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجانە ( خەبباب - خوا لیّی ڕازی بیّت - دەرچوو لە ئازارو توانی سەرکەویّت بەسەر دوژمنداری قوڕەیش‌و ، بەخۆگرتن‌و ئارام گرتنیش توانی بەسەر دەروونی خۆی زاڵ بیّت ...

ئەم بڕوادارە یاوەرە بەڕیّزە بەسەر زۆر تاقی‌کردنەوەی سەخت دا سوڕایەوە ، بەڵام پاش ئەوەی چەند قومیّك لە حیکمەتەکانی ئایەتەکانی خوای خواردەوە و ، دڵ‌و ویژدانی خۆی پڕ کردو ، مزگێنی‌دا بە زۆر شویّنی مەککە ، گەورەترینیشیان موسڵمان بوونی ( ئیمامی عومەر ) بوو ...

پاشان کۆچی کرد بۆ مەدینە ، پاش ئەوەی پیّغەمبەری خوا ﷺ ڕیّگای پیّدا بە هاوڕیّ‌یەتی بڕوادارێکی تر ، هەروەك خۆی ئامۆ لە مەککە ، ئەویش ( مقداد کوڕی عەمرو ) بوو - خوا لیّی ڕازی بیّت - ئەوەبوو هەردووکیان لە میوانداریەتی ( کلثوم کوڕی الهدم ) دابەزین تا کۆچی دوایی کردو پیّش دەرچوونی پیّغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەنگی ( بەدر ) بەماوەیەکی کەم ، پاشان چوون بۆ میوانداریەتی ئەنصاری‌یەکی تر لە لای مانەوە تا موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر قەڵای ( بني قريظة ) لیّرەدا ( خەبباب‌و مقداد ) بوون بە خاوەن جیّگای خۆیان‌و جیّنشین بوون‌و پیّغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نیّوان ( خەبباب )و ( جەبر کوڕی عەتەیك ) کەوا یەکیّك بوو لە گەورە پیاوانی ئەنصار ...

لیّرەدا دەوری ( خەبباب ) - خوا لیّی ڕازی بیّت - لە جیهادی ئارامگرتنەوە گۆڕا بۆ جیهادی شمشیّرو ڕووبەڕووبوونەوە .

( خەبباب ) بەشداری لە هەموو دیمانەو جەنگەکانی پیّغەمبەری خوا ﷺ کرد ، هەموو ژیانی خۆی لە پاراستنی ئیمانەکەی تەرخان کرد ...

کاتیّك ( بيت المال )ی موسڵمانان لە سەردەمی ( ئیمامی عومەرو ئیمامی عثمان ) - خوا لیّیان ڕازی بیّت - موچەی بڕیەوە ، ( خەبباب ) بوو بە خاوەن ڕاتبیّکی گەورە بەوەی موهاجیرە سەرەتایی‌یەکان بووە بۆ ئیسلام کاتیّك ناکۆکی لە نیّوان ( ئیمامی عەلی‌و معاويە ) دەستی پیّکرد ( خەبباب ) لایەنی ( ئیمامی عەلی ) بە هەموو ئازادی‌یەکی هەڵبژاردنی خۆی هەڵبژارد ، لەبەر ئەوەی هەڵویّستی ( ئیمامی عەلی ) بەڕاست ترو دروست تر دەزانی .

بەم جۆرە گواستیەوە بۆ کوفە ، لیّرەدا بە هۆی بڕینەوەی ئەم ڕاتبە لە لایەن ( بيت المال ) توانی ماڵیّك پیّکەوە بنیّت ، ( خەبباب ) پارەکانی لە شویّنیّك دادەنا هەموو کەسیّك جیّگاکەی پیّدەزانی ، هەر کەسیّك پیّویستی پیّی هەبوایە کەم‌وکورتی بۆ نەدەکرد

لەگەڵ ئەمەشدا ( خەبباب ) خەو لە چاوی نەدەکەوت ، فرمیّسکی وشك نەدەبووەوە ، هەر کاتیّك یادی پیّغەمبەری خوا ﷺ ئەو یاوەرانەی دەکردەوە کەوا ژیانی

بۆ خوا لەگەڵ بردبوونە سەر ، پێش ئەوەی خۆشی دونیایان لەسەر بکرێتەوە گەیشتن بە پەروەردگار .
ئینجا لێرەدا گوێ بگرن لە ( خەبباب ) چۆن لەگەڵ ئەوانە دەدوێ کەوا سەردانی نەخۆش دەکەن :-
پێیان گوت :-
مزگێنی ئەی باوکی عبداللە ، بەیانی تۆ دەگەی بە برایەکانت لە کاتێك دەستی کرد بە گریان و گوتی :-
{ماڵ ئاوایی منی نەترساندووە ، بەڵام ئێوە چینێك و برایەکتان بەیاد من هێناوە ، پاداشتی کردەوەکانیان لەگەڵ خۆیان بردو هیچ خۆشی یەکی دونیایان بەدەست نەهێنا
ئێمە لە دوای ئەوان ماینەوە تا دونیامان وەدەست هێنا و هیچ شوێنێکمان نەبینی یەوە بۆ ئەوەی ماڵی دونیای لەناو دابنێین تەنها خۆڵ نەبێت }
پاشان ئاماژەی بۆ ئەم شوێنە کرد کەوا ماڵی تێدا دانابوو وگوتی :-
{سوێند بە خوا داوم لەم پارەیە نەداوەو ، قەدەغەشم نەکردووە لە هیچ کەسێك کەوا پێویستی پێ هەبێت } .
پاشان ئاوڕی لەم کفنە دایەوە کەوا بۆیان ئامادە کردبوو ، شێوەیەکی نازو نیعمەت و ئیسرافی پێوە دیار بوو ، کاتێك فرمێسك لە چاوەکانی قەتیس مابوو گوتی :-
هەرچی ( حەمزە )ی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە کە شەهید بوو کفنیان بۆ دەست نەکەوت ، تەنها عەبایەك نەبێت ، ئەگەر لای سەرت پێ دادەپۆشت لای پێیەکانی کورت دەکرد ، ئەگەر لای پێیەکانت پێ دادەپۆشی سەری بەدیار دەکەوت .
( خەبباب ) - خوا لێی ڕازی بێت - لە ساڵی ( سی وحەوتی ) کۆچی لە تەمەنی ( حەفتا و سێ ) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد
( ئیمامی عەلی ) - خوا لێی ڕازی بێت - پاش گەڕانەوەی لە جەنگی ( صیفین ) نوێژی لەسەر کردو لە دەرەوەی شاری کوفە بە خاکیان سپارد ، ( ئیمامی عەلی ) دەربارەی فەرموویەتی :-
{ ڕەحمەتی خوا لە (خەبباب ) بێت ، بە ئارەزووی خۆی موسڵمان بووو ، بە گوێڕایەڵی کۆچی کردو ، بە موجاهیدی ژیاو ، چەند جاران بەڵای بەسەر جەستەی داهات ....} .
بەم جۆرە مامۆستای هونەری شمشێر لە جاهیلی و مامۆستای هونەری خۆبەقوربانی دان لە ئیسلام کۆچی دوایی کرد ...
ڕەزای خوا لە بڕواداری یەکەمەکان ، خۆڕاگری سزادراوو ، قارەمانی کۆچ کردوو ( خەببابی کوڕی ئەرەت ) بێ ، خودای گەورە لەگەڵ ئەم یاوەرە بەڕێزە لە بەهەشتی نەعیم کۆمان بکاتەوە - انه هو سمیع مجیب - آمین .

*　　　　*　　　　*

# { ٧١ }

# ﴿ موعاذی کوڕی جەبەل ﴾

## ( شارەزاترینی ئومەتم بە حەلال و حەرام )

**پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ**

کاتێك نیمچە دورگەی عەرەب روناك بووەوە بە روناکی هەق و هیدایەت ، ئەم منداڵە ( یەثریب )یە ( موعاذی کوڕی جەبەل ) گەنجێکی تەڕوناسك بوو ...

( موعاذ ) لە نێو هاوشانەکانی خۆی جیادەکرایەوە بە بیرتیژی و قسەزانی و زمان پاڵێوی و وورە بەرزی ....

لەگەڵ ئەم هەموو سیفەتە بەرزانە گەنجێکی ڕێكوپێك و جوان و پرچ ڕەش و گرووازە بوو ، ئەو چاوەی تەماشای دەکرد دڵی بۆی بەجێدەما

( موعاذی کوڕی جەبەل ) لەسەر دەستی بانگخوازی مەککەیی ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) موسڵمان بوو . لە شەوی ( عەقەبە ) دەستی درێژ کرد بۆ دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەناو دەستی ناو موبایەعەی کرد ...

( موعاذ ) لەگەڵ کۆمەڵێك حەفتا و دووکەسە بووﷺ ڕێگای مەککەیان گرتە بەر ، بۆ ئەوەی شادبن بە گەیشتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەورەبن بە بەیعەکەی و ، بۆ ئەوەی لە لاپەڕەکانی مێژوو پاکترین و مەزنترین لاپەڕە تۆمار بکەن

ئەم گەنجە خوێن گەرمە هەرکە گەڕایەوە شاری مەدینە کۆمەڵێکی لە هاوشان و پێڕی خۆی دروست کرد بۆ شکاندنی بتەکان و ، دەرهێنانیان بە نهێنی یان بە ئاشکرا لە ماڵەکانی گاوران لە (یەثریب ) ئینجا بە هۆی کاری ئەم کۆمەڵە گەنجە پیاوێکی زۆر لە پیاوانی (یەثریب ) موسڵمان بوون ، یەکێك لەمانە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ( عەمری کوڕی جەموح ) بوو – خوا لێی ڕازی بێت – ئەوەبوو ( موعاذ ) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی موسڵمانی لە تاریکایی شەو دەچوونە ماڵی ( عەمرو کوڕی جەموح ) ئەوەی خراپ بوو بە بتەکانیان دەکرد ، تاکو ( عەمرو ) بەخۆی داهاتەوە وازی هێنا لە بت پەرستی و ڕێگای هەق و هیدایەتی هەڵبژاردوو بە موسڵمان بوونێکی ڕاست و دروست موسڵمان بوو ..

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی پیرۆزی هێنا بۆ ( یەثریب ) و ئەم شارەی بە روناکی هیدایەت ئاوەدان کردەوە ، ( موعاذ ) هەروەك سێبەر بەرۆکی خاوەنەکی بەرنەداو ، قورئانی لێوەرگرت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام ، تاکو بۆ بەیانی وای لێهات بوو بە باشترین یاوەرە قورئان خوێنەکان ، لە هەموویان زیاتر شارەزای ئایینەکەی بوو

یەزیدی کوڕی قوطەیب دەگێڕێتەوە و دەڵێت :

ڕۆیشتمە ناو مزگەوتی ( حمص ) چاوم کەوت بە گەنجێکی پرچ گروازە ، خەڵك لە دەوری کۆمەڵەیان کردبوو

هەرکە قسەی کرد دەتگوت روناکی ومرواری لە دەمی دەردەچێت

گوتم :- ئەمە کێیە ؟!

گوتیان :- ( موعاذی کوڕی جەبەل )ە

ئەم پیاوە لە روناکبیری و بیرتیژی هەر لە ( ئیمامی عومەر ) دەچوو ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوانەی یەمەنی کرد پێی فەرموو :-

{ بەچی فەرمانی نێوان خەڵك دەکەیت ئەی ( موعاذ ) } ؟

( موعاذ ) وەڵامی دایەوە :-

{ بە کتابی خوا }

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :- { ئەگەر لەناو کتابی خوا نەتبینیەوە } ؟؟

( موعــاذ ) گوتــی :-

{ بەسوننەتی پێغەمبەرەکەی کاردەکەم }

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

{ ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەرەکەشی نەتبینیەوە } ..؟؟

( موعاذ ) گوتی :- { خۆم بۆ ماندوو دەکەمو کەمو کورتی بۆ ناکەم }

رووی پاکی پێغەمبەر گەشایەوەو فەرمووی :-

{ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەوا نوێنەری پێغەمبەری خوای ﷺ سەرکەوتوو کرد بەوەی بۆ ئەم کارەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی ڕازییە ...}

ئەوەی جێگای سەرسوڕمان نیە ئەوەیە ( موعاذ ) هەر لە تەمەنی گەنجییەوە لە قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردە بوو ، لەژێر دەستی ئەو بڕوانامەی وەرگرت و لە سەرچاوە پاکەکانی ئەو زانستی وەرگرت

لەم سەرچاوە ڕەسەنە پەروەردە بوو ، بوو بە باشترین قوتابی لە لای باشترین مامۆستا

( موعاذ ) بوو بە شارەزاترینی ئوممەتی ئیسلام سەبارەت بە حەڵاڵو حەرام ، جگە لەمەش بەمە گەورە بوو لەسەر ئەم ئوممەتە کەوا یەکێك بوو لەم شەش کەسانەی قورئانیان کۆکردەوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەبەر ئەوە کاتێك یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ قسەیان لەگەڵ ( موعاذی کوڕی جەبەل ) دەکرد بە هەیبەتو مەزنی تەماشایان دەکرد لەبەر ڕێزلێنان لە زانستەکەی

پێغەمبەری مەزنو ﷺ یاوەرەکانی لە دوای خۆی ئەم ووزە زانستییە بێوێنەیان لە خزمەتی ئیسلامو موسڵمانان بەکار دەهێنا

بەڵێ دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك تەماشای دەکرد وا کۆمەڵی قوڕەیش پۆل پۆل دێن بۆ ناو ئایینی خوا ، پاش فەتحی مەککە

هەستی کرد ئەم موسڵمانە نوێیانە پێویستی‌یان بە مامۆستایەکی گەورە هەیە بۆ ئەوەی ئیسلامیان فێر بکات‌و شارەزایان بکات لە ئایین ، فەرمانی کرد بە ( عتاب کوڕی اسید ) لە مەککە بمێنێتەوە لەگەڵ ( موعاذی کوڕی جەبەل ) بۆ ئەوەی خەڵك فێری قورئان بکەن‌و شارەزایان بکەن لە ئایینی خوا

کاتێك نوێنەری یەمەنیش هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد لەگەڵ موسڵمان بوونی خەڵکانی تریش ، داوایان لێ‌کرد چەند کەسێکیان لەگەڵ بنێرن بۆ ئەوەی خەڵك فێری ئایین بکەن ئینجا بۆ ئەم کارە گرنگە چەند بانگەهێزێکی لە یاوەرەکانی خۆی هەڵبژاردو ( موعاذی کوڕی جەبەل )ی لەسەرکردن بە ئەمیر ....

پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لە نوێنەری هیدایەت‌و روناکی بکات

به پیادە پێغەمبەر لە ژێر کاروانی ( موعاذ ) بە سواری بوو ...

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن لەگەڵ (موعاذ ) ، هەروەکو بڵێیت بیەوێت بە تەنها لەگەڵی بێت

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیەتی ( موعاذ )ی کردو فەرمووی :-

ئەی ( موعاذ ) لەوانەیە تۆ پاش ئەم ساڵە بە من نەگەیتەوە

لەوانەیە تۆ بەلای مزگەوت‌و گۆڕی من تێپەڕی

( موعاذ ) ئارامی لێ‌بڕاو دەستی کرد بە گریان بە هۆی جیابوونەوەی پێغەمبەرو خۆشەویستەکەی موحەممەد ﷺ ، موسڵمانانیش لەگەڵ ئەو دەستیان کرد بە گریان

نیگای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاست دەرچوو ، جارێکی تر لەپاش ئەو بەرێکەوتنە ( موعاذ ) - خوا لێ‌ی ڕازی بێت - چاوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوت

بەم جۆرە پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی پاکی سپارد پێش ئەوەی ( موعاذ ) لە یەمەن بگەڕێتەوە

ئەمەش گومانی تێدا نی‌یە کاتێك ( موعاذ ) لە یەمەن گەڕایەوە بۆ مەدینە دەستی کرد بە گریان کاتێك بینی بێ‌بەشە لە یاوەریەتی خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ

( موعاذ ) دەگێڕێتەوەو دەڵێت :-

{ ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم پاشان فەرمووی :-

ئەی ( موعاذ ) سوێند بە خوا من تۆم خۆش دەوێت ، منیش پێم گوت :-

دایك‌و باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، سوێند بە خوا منیش تۆم خۆش دەوێت ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :-

ئەی ( موعاذ ) ئامۆژگاریت دەکەم لەپاش هەموو نوێژێك لەیادت نەچێت بڵێیت :

(( اللهم أعني على ذكرك و شكرك و حســــن عبادتــــك ))

( موعاذی کوڕی جەبەل ) – خوا لێی ڕازی بێت – لە هیچ دیمانەو جەنگێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوا نەکەوت بەڵکو دەورێکی یەکجار مەزنی گێڕا لە جەنگەکانی ( بەدرو ئوحدو خەندەق ) لە خەلافەتی ( ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ) کرا بە ئەمیری خەڵك بۆ حەجی ماڵی خوا ، لەم ساڵەدا ( موعاذ ) لە یەمەن هات بۆ حەج کردن ، هەروەها هەندێك بەندەو هەندێك ماڵی لەلا بوو ، کاتێك ( ئیمامی عومەر ) لە کاتی حەج چاوی پێکەوت و پێی گوت :–

( من أين لك هذا يا معاذ و قد ذهبت الى اليمن فقيراً ) ؟

واتە :–

ئەمەت لە کوێ بوو ئەی ( موعاذ ) کاتێك ڕۆیشتی بۆ یەمەن هەژار بوویت ؟

( موعاذ ) گوتی :– ئەوەم لە حەڵاڵ پەیدا کردووە .

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :–

بەگوێم بکە ئەمانە ببە بۆ لای ( ئیمامی ئەبوبەکر ) ئەگەر پێی دای ، دەبێت بە موڵکی تۆ .

( موعاذ ) گوتی گوێڕایەڵیت ناکەمو ، ئەم ماڵە حەڵاڵە ...

شەوێکی بەسەر چوو پاشان هەڵساو گوتی :–

ئەی ( کوڕی خەطاب )وای تێدەڕوانم گوێڕایەڵیت بکەم من ئەم شەو لە خەودا بینیم هەروەك بڵێی ڕایاندەکێشام بۆ ناو ئاگر تۆش من گرتبووو نەدەهێشت ...

چوونە لای ( ئیمامی ئەبوبەکر )و گوتی :– ئەم ماڵە ماڵی تۆیە ...

( ئیمامی ئەبوبەکر ) گوتی :– ئەوانە بۆ تۆ .

( ئیمامی عومەر ) گوتی :– ئێستا حەڵاڵەو نۆشی گیانت بێت .

( موعاذ ) ڕۆیشتەوە بۆ شوێنی خۆی ئەم کۆیلانەی نوێژیان لە پشت دەکرد کاتێك نوێژەکانیان تەواو کرد پێی گوتن :– بۆ کێ نوێژ دەکەن ؟

گوتیان :– بۆ خوای گەورەو پاك .

( موعاذ ) گوتی :– بڕۆن ئێوە ئازادن لە پێناوی خوا

ئینجا لەبەر پاکی و دڵسۆزی و زانایی ئەم پیاوە ،( ئیمامی عومەر ) لە زۆربەی کارەکانی ڕاوێژی پێدەکرد ... هەتا لە هەندێك هەڵوێستدا بیروڕای ( موعاذ )ی وەردەگرت و دەیگوت :–

{ لولا معاذ بن جبل لهلك عمر }

واتە :– ئەگەر موعاذی کوڕی جەبەل نەبێت ( عومەر ) دەفەوتێت ...

کاتێك ( ئیمامی عومەر )– خوا لێی ڕازی بێت – جڵەوی خەلیفایەتی گرتە دەست ، ( موعاذ )ی ڕەوانە کرد بۆ ( بەنی کلاب ) بۆ ئەوەی ماڵیان بەسەردا دابەش بکات و ( صەدەقە ) و خێری دەوڵەمەندەکان بەسەر هەژارەکان دابەش بکات ، ( موعاذیش

ئارەکەی جێبەجێکرد ، بەخۆو بەم پەڕۆکەی لەژێر کورتانی وڵاخەکەی دایدەنێت کەوا
بە ملی خۆی ئاڵاندبوو گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی ، خێزانەکەشی پێی گوت :-

چیت هێناوە لەم دیارییانەی کەوا فەرمانڕەوا دەیهێنن بە دیاری بۆ خۆیان ؟!

( موعاذ ) گوتی :-

تەماشاکەرێکی بە ئاگام لەگەڵ بوو هەموو شتێکی لەسەر دەژماردم ... !!

ئەویش پێی گوت :

تۆ دەستپاك بوویت لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر و پاشان عومەر تەماشاکەرێکی لەگەڵ ناردی بۆ ئەوەی لەسەرت بژمێرێت ؟ !!

ئەم قسە بڵاوەی کرد لەناو ماڵی عومەر ، لەلای ئەوان سکاڵای کرد

ئەمە گەیشتە ( ئیمامی عومەر ) ، ئەویش داوای ( موعاذ )ی کردو گوتی :-

ئایا من لەگەڵ تۆ تەماشاکەرم ڕەوانە کردووە لەسەرت بژمێرێت ؟!

( موعاذ ) گوتی :-

نەخێر ئەی ئەمیری بڕواداران ، بەڵکو من هیچ شتێکم نەدۆزیەوە پێی پاساو ( اعتذار ) بهێنمەوە تەنها ئەوە نەبێت ..

( ئیمامی عومەر ) - خوا لێی ڕازی بێت - زەردەخەنەی بردەوەو ، هەندێك ماڵی پێبەخشی و پێی گوت :- بەمە خێزانەکەت ڕازی بکە ....

یەکێك لە سیفەتە بەرزەکانی ( موعاذ ) ئەوە بوو فتوای بۆ خەڵك دەدا لە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا بوو ، لەبەر ئەوە پلەی ( موعاذ ) ئەوەندە بەرز بووبووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی دەیفەرموو :- ( موعاذی کوڕی جەبەل ) پێشەوای زانایانە ، هەروەها پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکرد ، هەروەك لە فەرموودەیەك دەگێڕنەوە کەوا پیاوێك دێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای ئەوە دەکات کەوا ناتوانێت ئاگای لە نوێژەکە بێت ، لەبەر ئەوەی ( موعاذ ) نوێژ درێژ دەکاتەوە .

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو :

(( أفتـان أنـت يا مُعـاذ !! مـن أمَّ بالنـاس فـليخـفـِّف ))

واتە :-

تۆ دەبیت بە ئاژاوەچی ئەی ( موعاذ ) !! هەر کەسێك پێش نوێژی بۆ خەڵك دەکات با بە سووکی بیکات

یەکێك لە سیفەتەکانی تری ( موعاذ ) هەموو یاوەرە بەرێزەکان ئەوەبوو ، گوێیان نەدەدا بە کۆکردنەوەی ماڵ یاخود دەوڵەمەندی خۆیان نیشان بدەن ... هەروەك مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا ( عومەری کوڕی خەطاب ) - خوا لێی ڕازی بێت - چوارد سەد دینار لەناو دەستەسڕێك دادەنێ و بە سەرکارێکی خۆی دەڵێت :-

ئەم پارەیە لەگەڵ خۆت ببە بۆ ( موعاذی کوڕی جەبەل ) کاتژمێرێك لە ماڵەکەی بمێنەوە بزانە چی بەم پارەیە دەکات

سەرکارەکە چووە لای ( موعاذ )و پێی گوت :-
ئەمیری بڕواداران پێت دەڵێت :- ئەمە بەکار بهێنە بۆ چەند پێویستی‌یەکت
( موعاذ ) گوتی :-
ڕەحمەتی خوای لێ بێ و پاداشتی بدرێتەوە ، پاشان گوتی :-
ئەی جاریە وەرە بڕۆ بۆ مالی فلان بەم پارەیەو ، بڕۆ بۆ مالی فلان بەم پارەیە ، خێزانی ( موعاذ ) بەدیار کەوت و گوتی :-
- ئێمەش سوێند بەخوا هەژارین پێمان ببەخشە _ تەنها دوو دیناری لەلاما بوو دوو دینارەکەی مایەوە دای بە خێزانەکەی ...
سەرکارەکەی ( ئیمامی عومەر ) گەڕایەوە هەواڵی ئەمەی پێدا ، ئەویش دڵی پێی خۆش بوو، دوعای بۆ کرد ..
هەموو کات پێغەمبەری خوا ﷺ ، یاوەرەکانی خۆی تاقی‌دەکردەوە تا بزانێت ئیمانەکەیان لە چ ئاستێکە .
ڕۆژێکیان کاتی بەیانی بوو چاوی بە ( موعاذ ) کەوت و پێی فەرموو :
{ چۆن بەیانیت کردەوە ئەی ( موعاذ ) ؟؟ } .
( موعاذ ) گوتی :-
{ بەیانیم کردەوە بە بڕوادارێکی ڕاست و دروست ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ }
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :-
{ هەموو هەقێك بەڵگەیەکی هەیە ، ئایا بەڵگەی ئیمانی تۆ چی‌یە .. ؟؟ }
( موعاذ ) گوتی :-
( هیچ بەیانی‌یەکم نەکردۆتەوە ، ئەوا گومانم بردووە ناگەم بە ئێوارە )...
وە ئێوارەم نەکردۆتەوە ، ئەوا گومانم بردووە ناگەم بە بەیانی
هەر هەنگاوم هاوێشتبێت ، ئەوا گومانم بردووە هەنگاوەکانی تر ناهاوێم
هەروەکو بلێیت تەماشای هەموو ئومەتێکی وەستاو دەکەم چاوەڕێی کتابی خۆی بکات .
هەروەکو بلێیت تەماشای خەڵکی بەهەشت دەکەم لە بەهەشت لەخۆشی‌دان وە خەڵکی ئاگر لەناو ئاگر ئازار دەچێژن .. )
پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :- زانیت و خووی پێوە بگرە
لە سەردەمی خەلیفایەتی ( ئیمامی عومەر ) فەرمانڕەوایی ولاتی شام ( یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان ) - خوا لێی ڕازی بێت - هاتە لای و گوتی :-
ئەی ئەمیری بڕواداران ، خەڵکی زۆرەو پڕ بووە لە شار ، پێویستیان بەوە هەیە فێری قورئانیان بکەین و شارەزایان بکەین لە ئایین ، ئەی ئەمیری بڕواداران یارمەتیم بدە بە چەند پیاوێك فێریان بکات ، ( ئیمامی عومەر ) ئەو پێنج کەسەی بانگ کرد کەوا لە زەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانیان کۆکردبووەوە

ئەوانەش ( موعاذی کوڕی جەبەل و عوبادەی کوڕی صامت و ابو ایوبی ئەنصاری و أبی کوڕی کەعب و ابو درداء ) بوون پێی گوتن :-

برایەکانتان لە خەڵکی شام داوایان لێکردم بەوانەی قورئانیان فێربکەن و شارەزایان بکەن لە ئایین یارمەتیم بدەن - خوا ڕەحمتان پێبکات - با سێکەس لە ئێوە ، ئەگەر حەز دەکەن ( اقتراع ) بکەن وەیان سێ کەس لە ئێوە دیار دەکەم

گوتـــیـــان :-

بۆ ( اقتراع ) بکەین ؟ ئەبو ئەیوب بەساڵاچووە و ابی پیاوێکی نەخۆشە و ئێمەش سێکەس ماوینەتەوە ، ( ئیمامی عومەر ) گوتی :-

بە ( حمص ) دەست پێبکەن ئەگەر ڕازی بوون بە حاڵی خەڵکەکە ، یەکتان لەوێ بەجێ بمێنن یەکێکتان بڕۆن بۆ دیمەشق و ئەوی تر بۆ فلسطين .

هەر سێ یاوەرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسان بەوەی ( فاروق ) فەرمانی پێکردبوون لە ( حمص ) پاشان ( عوبادەی کوڕی صامت )یان لەوێ بەجێهێشت و ، ( ئەبو درداء ) بۆ دمەشق و ( موعاذی کوڕی جەبەل )یش بۆ فلسطين

لەم شوێنە ( موعاذ ) تووشی ( طاعون ) هات .

کاتێك مردنی لێ‌نزیك بوویەوە ڕووی لە قیبلە کردو گوتی :-

بەخێربێت مردن بەخێر بێت ...

میوانێك هات پاش ئەوەی بزر بوو ...

وەك خۆشەویستێك بە پەرۆشەوە هات ...

پاشان ڕووی لە ئاسمان کردو گوتی :-

پەروەردگارا تۆ ئاگاداریت من حەزم لە دونیا نەکردووە بە درێژایی مانەوەم تێیدا بۆ چاندنی دارو ڕۆیشتنی ڕووبار ...

بەڵکو بۆ تینوویەتی لە چۆلایی و ، ناخۆشی کاتەکان و ، گفتوگۆ لەسەر چۆك لەگەڵ زانایان لە بازنەی یادی خوا

پەروەردگارا دەروونم قەبووڵ بکە بە چاکە هەروەك دەروونێکی بڕوادار قەبووڵ دەکەیت ..

پاشان گیانی پاکی لە دووری کەس‌وکارو هۆزەکی ، کۆچ کردوو لە ڕێگای خواو ، بانگهێژی بۆ خوا ، بەرەو بارەگای پەروەردگار بەڕێ کەوت ...

*　　　*　　　*

٧٣

# عبدالرحمن كوڕى ئەبوبەكر

## ئەو یاوەرەی بیروباوەڕەكەی بە دونیا نەفرۆشت

# {٧٢}
# ﴿عبدالرحمن كوڕی ئەبوبەكر﴾
# ئەو یاوەرەی بیروباوەڕەكەی بە دونیا نەفرۆشت

ئەم یاوەرە دیمەنێكی بەرزە لە مێژووی پڕ سەروەری ئیسلام ...

لە كاتێكدا باوكی یەكەمین بڕوادار بوو .. ئەم ڕاستگۆیەی بڕوای هێنا بە خواو بە پێغەمبەرەكەی ﷺ بڕوا هێنانێك هیچ چەشن و وێنەیەكی نەبوو ، خەلیفەی یەكەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ... هەرچی ( عبدالرحمن ) بوو خۆڕاگر بوو نموونەی شاخ لەسەر ئایینی میللەتەكەی و ، بتەكانی قوڕەیش .....!!

لە جەنگی بەدر ، لەگەڵ سوپای گاوران وەكو جەنگاوەرێك دەرچوو بۆ جەنگی موسڵمانان ...

لە جەنگی ئوحدیش وەكو تیرهاوێژێك قوڕەیشەكان هێنایان بۆ جەنگی موسڵمانان

پێش ئەوەی هەردوو سوپاكە پێك دا بدەن و هێرش بۆ یەكتر بهێنن ، لە سەرەتادا هەروەكو خویەك جەولەی شەڕە شمشێری تەن بە تەنی دەستی پێكرد ...

( عبدالرحمن ) هاتە دەرەوەو داوای لە موسڵمانان كرد بۆ جەنگی تەن بەتەنی

( ئەبوبەكری صەدیق ) - خوا لێی ڕازی بێت - بۆی هەڵسایەوە بۆ ئەوەی شەڕە شمشێری لەگەڵ بكات ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ گرتی و ، نەیهێشت ئەم شەڕە شمشێرە لەگەڵ كوڕەكەی بكات ...

لەگەڵ ئەوەی ( عبدالرحمن ) دەیزانی پلەوپایەی باوكی و ، بڕواییەكی بە تینی هەبوو بە بەرزی دەروونی و بە گەورەیی ڕەوشتی و بە زیرەكی ، بەڵام لەگەڵ ئەمەش ( عبدالرحمن ) هەر بە بت پەرستی و بێ بڕوایی مایەوە بەبێ ئەوەی بە دوای ڕێبازی باوكی بكەوێت ، ئیسلام بوونی باوكی نەبووە هۆی ئەوەی لە ئایینی باپیران و میللەتەكەی هەڵیگێڕێتەوە

بەم جۆرە ( عبدالرحمن ) لە شوێنی خۆی مایەوە ، هەڵگری ئاڵای هاوبەش پەیداكەران بوو و بەرگری لە خواكانی قوڕەیش دەكردو ، شەڕی مان و نەمانی لەگەڵ موسڵمانان دەكرد بەڵام هەموو كات بەهێزە ڕەسەنەكان لەم جۆرە پیاوانە ، هەقیان لە پێش چاو بزر نابێت هەرچەندە كاتیشی بەسەردا بچێت .

جەوهەری ڕەسەنایەتی و ، دڵسۆزی و ڕوناكی هەر بەدیار دەكەوێت هەرچەندە بۆ ماوەیك وەكو زێر لە ژێر گڵ بن بەڵام تەڕاتی و ئاوهەوا هەرگیز كاریان لێناكات هەر كاتێك بەدیاركەون بریسك دەدەنەوەو ، ڕۆژێك دێت لەم كاروكردەوانەی خۆیان پەشیمان دەبنەوەو دەست لە ملانێی هەق و ڕاستی دەكەن ، بە ئیسلامەكەیان شاد دەبنەوە ..

ئەو ئیسلامەی قەدەغەی هەموو یاسایەكی دەستكردی مرۆڤ دەكاو ، یاسای خوا بە مزگێنی دەهێنێ بۆ ئادەمیزادو لە تاریكایی دونیا ڕزگاریان دەكاو ، بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەكەی دڵیان خۆش دەكا

ڕۆژێك لە ڕۆژان كاتژمێری قەدەر لێی دەداو ، ڕۆژی لەدایك بوونی خۆی یاوەری بەڕێز ( عبدالرحمن كوڕی ئەبوبەكر ) دەست پێدەكاو موسڵمان دەبێت

بەم جۆرە چرای هیدایەتی دەروونی ( عبدالرحمن ) دادەگیرسێ و دەبریسکێتەوەو هەموو ئەو پاشماوانەی نەزانی لە تاریکایی و هەڵە ، کەوا لە دەروونی ( عبدالرحمن ) خۆی حەشارداوە ڕادەماڵێ و بەرەو زبڵدانی مێژوویان ڕەوانە دەکات ...

ڕاستی تەنهایی پەروەردگار دەبینێ لە هەموو ئەم سروشت و شتە سەیرو سەمەرانەی کە دروستکراوی خوای گەورەن ، ئیتر هیدایەتی خوای گەورە لە دڵ و دەرونی ( عبدالرحمن ) دەڕوێ و سێبەر لە دەروونی پاکی دەکا ، کەوا یەکێکە لە موسڵمانان ... !!!

یەکسەر بەبێ دواکەوتن ( عبدالرحمن ) باری تێك دەنێ و بەرەو جێگاو شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێ دەکەوێ و ، دەگەڕێتەوە بۆ ئاییني ڕاستی ، ڕووی پاکی ( ئیمامی ئەبوبەکر ) لە خۆشیان گەش دەبێتەوە کاتێك دەبینێت کوڕەکەی پەیمان نوێ دەکاتەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ..

( عبدالرحمن ) لە کاتی بێباوەڕی جۆرە پیاوێك بوو ... کاتێك هاتە ناو ئیسلام جۆرە پیاوێکی تری لێدەرچوو ئەپارەو موڵکی دونیا پاڵی پێوەنا ، نە ترس بۆ ئەم جێگایە بەڕێی کرد ، بەڵکو بە قەناعەت و بیروباوەڕی پاکی خۆی گەڕاندیەوە ناو هیدایەتی خواو ڕاستییەکانی ...

لێرەدا ( عبدالرحمن ) بەبێ کۆڵدان ، هەموو ماندووبوونی خۆی بەکارهێنا لە ڕێگای خوا بۆ قەرەبوو ( تعویض )کردنەوەی ئەو کاتانەی لە دەستی چوو بوو لە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەر ﷺ و بڕواداران ....

لە ڕۆژانی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژانی خەلیفەکانی ، ( عبدالرحمن ) لە هیچ جیهادو جەنگێکی ڕێگە پێدراو دوانەکەوت ...

ئەوەبوو ڕۆژی ( یەمامە ) بەشداریەکی یەکجار مەزنی کرد ، بە هۆی خۆڕاگری و کۆڵ نەدانی ، دەورێکی گەورەی گێڕا لە سەرکەوتنی موسڵمانان و شکست خواردنی ( موسەیلەمە )و هەڵگەڕاوەکان ... بەڵکو ( عبدالرحمن ) بەسەر گیانی ( محکم کوڕی طفیل ) ڕاگەیشت کەوا یەکەم پیلان گێڕ و پیاوی ( موسەیلەمە ) بوو ، کەوا بە هێزەکەی گرنگترین شوێنی لەشکری ( موسەیلەمە)ی دەپاراست و سوپای هەڵگەڕاوەکان لە [illegible] ناوەوەی خۆیان حەشار دابوو و خۆیان بەهێز دەکرد ، کاتێك ( محکم ) بەهۆی [illegible] لێدانەی لە لایەن ( عبدالرحمن ) پێی کەوت ، کەوتە سەر زەوی ئەوانەی دەوری [illegible] شپرزەیی بوون و ، شوێنێکی گەورە لە قەڵاکە بووەوە ، جەنگاوەرە موسڵمان[illegible] پێیدا چوونە ژوورەوە ...

بەهۆی ئەم هەڵوێست و کردەوە مەزنەی ( عبدالرحمن ) زیاتر لەناو [illegible] بەڕێزتر بوو زیاتر کێشی پەیدا کرد .

( عبدالرحمن ) گوێڕایەڵیەکی تەواوی هەبوو بۆ بۆچوونەکان و [illegible] ئەو شتە ڕاست و دروستانەی کەوا دەیبینی و هەموو ئەم شتە لاوارو [illegible] دەکردەوە کەوا دروست دەبوون لەسەر حیسابی بیروباوەڕەکەی

هەموو ئەم خووڕەوشتە بەرزانە ، سێبەری کردبوو لەسەر [illegible] ژیانی و، بە هیچ جۆرێك وازی لێنەدەهێنا نە لە ژێر باڵە[illegible] پیشاندانی ئارەزووەکانی ، تا لەم ڕۆژە تۆقێنەرە ، کەوا [illegible] بۆ ( یەزیدی )کوڕی بە زەبری شمشێر .... بۆ ( مەروا[illegible]

ـە ئـەم بەیعـەی نووسـی ، فـەرمانی پـێکرد لـە مزگـەوتی مەدینـە بـۆ موسـڵمانان
نێتەوە ...
مـەروان ) فەرمانەکـەی جێبـەجێکردو ، هێشـتا لـە خوێندنـەوەی نامەکـە تـەواو
بوو ، تا ( عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکر ) – خوا لـێی ڕازی بێت – لـێی هەڵسایەوەو
اتێکدا خەڵکەکـەی نـاو مزگـەوت سـام گرتبوونـی و نوقـەیان لەبـەرەوە نـەدەهات
الرحمن ) بە دەنگێکی بەرز وەك بروسك تەقی‌یەوەو گوتی :–
( سوێند بەخوا مەبەستتان ڕاوێژو هـەڵبژاردن نی‌یە بۆ ئوممـەتی موحەممـەد ﷺ
ئێوە دەتانەوێت ڕێبازی هیرقەلی‌یەکان بگرن ، هەرکە هیرقەلـی‌یەك مرد هیرقەلـێکی
نەوەی ئەو لە شوێنی دادەنرا )) .
ەم کات و ساتەدا ( عبدالرحمن ) بینی هەموو مەترسی‌یەك چاوەڕوانی چارەنووسی
لام دەکات ، ئەگەر ( معاویە ) ئەم فەرمانە دەربکات ، دەستووری ئیسلام لە ڕێبازی
ژەوە کەوا ئوممـەت خۆی فەرمانڕەوای خۆی هـەڵدەبژێرێت ، دەگۆڕێت بۆ ڕێبـازی
سەری و کیسرایی‌یەکان کەوا حوکمی لەدایك بوون و ڕێککەوت دەچەسپێنێ بەسەر
ەت دا قەیسەر لە دوای قەیسەر .... !!!
ەرکـە ( عبدالرحمـن ) بـەرەنگاری ( مـەروانی کـوڕی حەکـەم ) بـۆوە بـەم ووشـە
نێرانە ئەوەبوو چینێك لە موسڵمانان لە سەرووی هەموویان ( حوسەین کوڕی عەلـی
دالله کوڕی زوبەیرو عبدالله کوڕی عومەر ) پشتیوانی‌یان کرد ....
بەڵام بارودۆخی وا هاتە پێشەوە وای لە ( حوسەین و کوڕی زوبـەیرو کوڕی عومـەر )
– خوا لـێیان ڕازی بێت – بێدەنگی بنوێنن بەرامبـەر ئەم بەیعەی کەوا ( معاویـە )
ری بۆ داوەو وەربگیرێ بە زەبری شمشێر ...
هـەرچی ( عبدالرحمـن ) بوو هـەر لەسـەر بیروڕاکـەی خـۆی سـوور بـوو ، ئـەوەش بـە
وەشاندنەوەی ئەم بەیعە ، ئـەوەبوو ( معاویـە ) ( صـەد هـەزار ) درهـەمی بـۆ ڕەوانـە
، بۆ ئەوەی دڵـی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت ، ( عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکر ) پارەکـەی
داوە پێشی و لـێی دوورکەوتەوە بە نوێنەری ( معاویە )ی گوت :–
{ بۆ لای ( معاویە ) بگەڕێوەو پێی بڵێ :–
( عبدالرحمن ) ئایینی خۆی بە دنیا نافرۆشێت } ..
کـاتێك ( عبدالرحمـن ) بەمـەی زانـی ( معاویـە ) دێـت بـۆ مەدینـە ، بارگـەی تێکنـاو
ینەی بەجێهێشت و ڕووی کردە مەککە ..
خوا حەزی وابوو ( عبدالرحمن ) لەم فیتنەیە بپارێزێت لەگەڵ ئەنجامی خراپی ئەم
ە کەوا بارودۆخ دروستی دەکات ... !!
هەرکە گەیشتە مەککە بە تەواوی جێنشین نەبوو بوو تا خوای گـەورە گیانی پـاکی
لای خۆی بردەوە ، تـەرمی پیرۆزی لەسـەر ملی پیاوانی مەککـە هـەڵگیراو لـەوێ بـە
کیان سپارد ، لەسەر ئەم خۆڵەی لـێی پەروەردە بووبوو هیدایەتی بۆ هات بوو ...
موسڵمان بوونێکی ڕاستگۆیانەو ، ئازایانەو ئازادانە ....
خوای گـەورە لـە یـاوەری بـەڕێزو دڵسۆزو قارەمانی ئیسلام ( عبدالرحمـن ی کـوڕی
بوبەکر ) ڕازی بێت ..

* * *

# ابو درداء

(ابو درداء) بە هەردوو دەستو سینگیەوە پاڵی بە دونیاوە دەناو لە خۆی دوور دەخستەوە

(عبدالرحمن کوڕی عەوف)

# {٧٣}

## ﴿ ابو درداء ﴾

**{( ابو درداء ) به هەردوو دەستو سینگیەوە پالی بە دونیاوە دەناو دونیای لە خۆی دوور دەخستەوە }. ( عبدالرحمن کوڕی عەوف )**

( عومەیری کوڕی مالکی خەزرەجی ) ناسراو بە ( ابو درداء ) ، لەگەڵ گەردی بەیانی لەخەو هەڵساو ، ڕۆیشت بۆ لای بتەکەی کەوا لە بەرزترین شوێن لە ماڵەکەی قایمی کردبوو ، سڵاوی لێدەکردو بە خۆشترین بۆن کەوا بازرگانە گەورەکان بۆیان هێنا بوو بۆنی لێدەدا ، پاشان دایدەپۆشت بە نوێترین جلوبەرگ لە جوانترین هەریر ، کەوا یەکێك لە بازرگانەکان لە یەمەن بۆی هێنا بوو .

کاتێك ڕۆژ چەند میلێك بەرز بووەوە ( ابو درداء ) ماڵەوەی بەجێهێشتو ڕووی لە دوکانەکەی کرد ....

لەم کاتەدا کوچەو کۆڵانەکانی ( یەثریب )تەسك ببووەوە بەهۆی شوێنکەوتووەکانی موحەممەد ﷺ ، بەهۆی گەڕانەوەیان لە جەنگی بەدر ، لە پێشەوایان چەند پۆلێك لە دیلەکانی قورەیش هەبوون ، بەڵام ئەوەندەی نەبرد چاوی کەوت بە گەنجێك لە موسڵمانە خەزرەجیەکان و پرسیاری ( عبداللەی کوڕی ڕەواحەی ) لێکرد :-

گەنجە خەزرەجیەکە پێی گوت :-

بەشدارییەکی چاکی جەنگی کرد و بەغەنیمەت و سەلامەتیش گەڕایەوە ، دڵنیا بە لێی هەروەها پرسیارکردنی ( ابو درداء ) سەبارەت بە ( عبداللەی کوڕی ڕەواحە ) شتێکی سەیر نەبوو ، کاتێك خەڵك دەیانزانی ئەو پەیوەندییە برایەتییەی کە بەیەکەوەی بەستابوونەوە ، لەبەر ئەوەی ( ابو درداء ) و( عبداللەی کوڕی ڕەواحە ) هاوڕێی یەکتر بوون لە کاتی جاهیلی ، کاتێك ئیسلام هات کوڕی ڕەواحەی لە باوەش گرتو ( ابو درداء )یش پشتی تێکرد ...

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم شتە نەبووە هۆی پچڕانی پەیوەندی نێوانیان ، ( عبداللەی کوڕی ڕەواحە ) بەردەوام سەردانی ( ابو درداء )ی دەکرد ، داوای موسڵمان بوونی لێدەکرد و هانی دەدا بۆی ، خەمی لە هەمو ئەم ڕۆژانە دەخوارد لە تەمەنی دەڕۆیشت بە بێباوەڕی

( ابو درداء ) گەیشتە دوکانەکەی ، لەسەر کورسییە بەرزەکەی بە ئیسراحەت دانیشت خەریکی کڕینو فرۆشتن بوو ، فەرمانی بە کارمەندەکانی دەکرد .

لە کاتێکدا هیچ شتێکی نەدەزانی کەوا چ ڕوودەدا لە ماڵەکەی لەم کاتەدا ( عبداللەی کوڕی ڕەواحە )دەڕۆیشت بۆ ماڵی هاوڕێیەکەی ( ابو درداء ) بە نیازی کارێك ...

کاتێك گەیشتە ماڵیان بینی دەرگا کراوەیەو چاوی بە دایکی ( درداء ) کەوت لە حەوشەکە ، ( عبداللە ) گوتی :-

سلام عليك ئەی بەندەی خوا
وەڵامی دایەوە :– و عليك السّلام ئەی برای ( ابو درداء ) ..
( عبداللّه ) گوتی :– ( ابو درداء ) لە کوێیە ؟
ئەویش گوتی :– ڕۆیشت بۆ دوکانەکەی ، زۆر نامێنێتەوەو دەگەڕێتەوە
( عبداللّه ) گوتی :– ڕێگام پێ دەدەیت ؟
ئەویش گوتی :– بەخێر بێیت و دەرگا کراوەیە ، ڕێگای بۆ کردەوە ، ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی ئەویش خەریك بوو بە چاککردنی ماڵەکەی‌و چاودێری منداڵەکانی ...
( عبداللّەی کوڕی ڕەواحە ) چووە ئەم ژوورەی کەوا ( ابو درداء ) بتەکەی تێدا دانابوو ، ( تەپشوو )ەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو دەریهێناو ، کەوتە سەر بتەکە پارچە پارچەی دەکردو دەیگوت :–
بزانە هەر شتێك لەگەڵ خودا بانگی بۆ بکەیت بەتاڵە ... بزانە هەر شتێك لەگەڵ خودا بانگی بۆ بکەیت بەتاڵە ...
کاتێك تەواو بوو لە شکاندنی گەڕایەوە ماڵەوە ...

*　　　　*　　　　*

دایکی ( درداء ) کاتێك چووە ئەم ژوورەی بتەکەی لێبوو ، سام گرتی بوو کاتێك بینی چی‌کراوە بە بتەکەو ، پارچە پارچە کراوەو بەشەکانی بڵاوبۆتەوە سەر زەوی‌و ، بە دەستەکانی ڕوومەتەکانی دەڕنیەوەو دەیگوت :–
ئەی کوڕی ڕەواحە بە هیلاکت دام ...
ئەی کوڕی ڕەواحەبە هیلاکت دام ...
زۆری پێنەچوو تا ( ابو درداء ) گەڕایەوە ماڵەوە بینی خێزانەکی دانیشتووە لەبەر دەرگای ئەو ژوورەی بتەکەی تیابوو بە دەنگێکی بەرز دەگریا ، نیشانەی ترسیش لەسەر ڕوخساری دیاربوو ....!!!
( ابو درداء ) گوتی :– چی‌تە ؟
ئەویش گوتی :–
( عبداللّەی کوڕی ڕەواحە )ی برات هات ، کاتێك تۆ لە ماڵەوە نەبوویت ، ئەوەی دەیبینی بە بتەکەی کردی ...
( ابو درداء ) تەماشای بتەکەی کرد بینی تێکشکاوە ، ئاگری تێبەربوو ، هەڵسا بۆ تۆڵە کردنەوەی ، بەڵام زۆری نەبرد گڕی تووڕەیی دامرکایەوە ، تووڕەییەکەی قووت دایەوەو ، بیری کردەوە لەمەی ڕووی‌داوە ، پاشان گوتی :–
ئەگەر خێر بەم بتە هەبووایە ئەم ئازارەی لەسەرخۆی لادەدا ...
پاشان لەماڵەوە بەڕێکەوت بۆ لای ( عبداللّەی کوڕی ڕەواحە ) ، بە یەکەوە چوون بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، بڕواهێنانی خۆی بۆ ناو ئایینی خوا ئاشکرا کرد ، کۆتاکەس بوو لە کەس‌وکارەکەی بوو بە موسڵمان‌و باوەڕی هێنا
هەر لەم ساتەی ( ابو درداء ) بڕوای هێنا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ، بڕواهێنانێك لەگەڵ هەموو خانەکانی لەشی تێکەڵ بوو ...

زۆر پەشیمان بۆوە لەسەر ئەم خێرەی کە لەدەستی چوو بوو، بە تەواوی هەستی بەوە دەکرد کەوا هاوڕێکانی پێشی ئەو کەوتوون لە شارەزایی ئاینو لەبەرکردنی قورئان و ، خواپەرستی و لەخواترسانێك بۆ خۆیان هەڵیان گرت لەلای خوا ...
لەبەر ئەوە بڕیاریدا هەوڵو تەقەللا بدات بۆ گەیشتن بەم شتانەی لە دەستی دەرچووەو ، درێژە بە ماندووبوونی خۆی بدات بە ماندوویەتی شەو تا بگات بە کاروانو بە پێشیان بکەوێت ...
بەم جۆرە خۆی یەکلا کردەوە بۆ خواپەرستییەك و وازی لە دونیا هێنا ، هەروەك تێنوویەك پێشوازی کرد لە زانستی خوا ، زەینو بیری خۆی بە تەواوی هاوێشتە سەر کتابی خواو ووشەکانی لەبەر کردو ، لە تێگەیشتنی ماناکانی چووە خوارەوە ...
هەروەها کاتێك بینی بازرگانی ناهێڵێ تام لە خواپەرستی بکاتو ، کۆڕە زانیارییەکانی لەدەست دەدات بەبێ دوو دڵیو ئاخ هەڵکێشان بۆی وازی لێهێنا
لەسەر ئەمە یەکێك پرسیاری لێکرد ئەویش وەڵامی دایەوەو گوتی :-
{ من پێش پەیمان بەستنم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بازرگان بووم ، کاتێك موسڵمان بووم ویستم نێوان خواپەرستیو بازرگانی پێکەوە کۆبکەمەوە ئەوەی مەبەستم بوو بۆم نەلوا ، وازم لە بازرگانی هێناو چوومە ناو خواپەرستی ...
بەو کەسەی گیانی ( ابو درادء )ی بەدەستە ، لەم ڕۆژەوە حەزم نەکردووە دوکانێکی بچووکم لەسەر دەرگای مزگەوت هەبێو یەك نوێژم بە کۆمەڵ لەدەست بچێت ، پاشان بکڕمو بفرۆشم وهەموو ڕۆژێك ( سێصەد ) دینار قازانج بکەم } .
پاشان ڕووی لە پرسیارەکەرەکە کردو گوتی :-
من نالێم :- خوای گەورە بازرگانی حەرام کردووە ، بەڵام حەزم کردووە لەگەڵ ئەم کەسانە بم کە بازرگانی و فرۆشتن بێئاگایان نەکات لە یادی خوا ...
( ابو درادء ) تەنها وازی نەهێنا لە بازرگانی بەڵکو وازی هێنا ، و پشتی کرد لە جوانی و شتە ڕازاوەکانی ، ڕازی بوو بە پارووپەکی ووشك هێزی پێبگریت لەگەڵ جلوبەرگێکی دڕ لەشی پێداپۆشێت ...
کۆمەڵێك لە شەوێکی یەکجار سارد ڕوویان لە ماڵەکەیکرد خواردنێکی گەرمی بۆ ناردن ، کەلوپەلی نووستنی بۆ ڕەوانە کردن ، کاتێك خەویان هات گفتوگۆیان لەگەڵ یەکتر دەکرد دەربارەی کەلوپەلی نووستن ، یەکێکیان گوتی :-
من دەچم بۆ لای قسەیان لەگەڵ دەکەم ...
ئەویتریان گوتی :-
واز بێنە ، گوێ پێنەداو ، ڕۆیشت تاکو وەستا لەسەر دەرگای ژوورەکەی بینی پاڵکەوتووەو ، خێزانەکەی لە نزیکی دانیشتبوو بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی بەسەرخۆی دادابێو جلێکی کەمی لەبەردابوو گەرما و سەرما نەیدەپاراست .
پیاوەکە بە ( ابو دراده )ی گوت :-
دەبینم پاڵکەوتووی و هەروەك ئێمە پاڵکەوتووین !!!
کوا کەلوپەلتان ؟!
گوتی :-

لێرە خانوویەکمان هەیە یەك لەدوای یەك ئەو کەلوپەلەی بە دەستمان دەکەوێت بۆی ڕەوانە دەکەین ، ئەگەر لەم ماڵە شتێکمان مابێتەوە بۆتانی ڕەوانە دەکەین .

پاشان چەند کۆسپێکمان دێتەپێش لەم ڕێگایەی دەبڕین ئینجا ئەوەی باری سووك بێت باشترە لەوەی باری گرانە ، ویستمان ئەم بارە لەسەر خۆمان سووك بکەین بۆ ئەوەی ئەم ڕێگایە ببڕین ...

پاشان بە پیاوەکەی گوت :-

ئایا تێگەیشتیـــت ؟

ئەویش گوتـــی :-

بەڵێ تێگەیشتمو خواپاداشتی خێرت بداتەوە ...

*　　　　*　　　　*

( ئیمامی عومەر )- خوا لـێی ڕازی بێت - لە کاتی جڵەوی خەلافەتدا ویستی کاری فەرمانڕەوایـەتی بـە ( ابـو درادء ) بسـپێرێ لـە وڵاتـی شـام ئـەویش قـەبووڵی نەکرد ، ئەویش هەوڵی زۆر لەگەڵدا ( ابو درادء ) گوتی :-

ئەگەر ڕازی بەوەی بچم بۆ لایان فێری کتابی پەروەردگاریان بکەم لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەرەکەیان ﷺ و پێش نوێژیان بۆ بکەم ، ( ئیمامی عومەر ) بەمەڕازی بوو ، بەم جۆرە ڕۆیشت بۆ ( دیمەشق ) ، کاتێك گەیشتە ئەوێ بینـی خەڵکەکە کەوتونەتـە نـاو دونیاو ، لەخۆشی نقووم بوون و دواڕۆژیان لە بیر کردووە ، بۆیە ئەمەی پێکارەسات بوو ، بانگی خەڵکەکەی کرد بۆ مزگەوت دەورەیان لێداو لە نێوانیان وەستاو گوتی :-

ئەی خـەڵکی ( دیمەشـق ) ئێـوە بـران لـە ئـایینو ، دراوسـێن لـە مـاڵو پشـتیوانن لەسەر دوژمنان

ئەی خەڵکی ( دیمەشق ) ، چی واتان لێدەکات قەدەغەتان بکات لە گوێڕایەڵی منو ئامۆژگاریەکانم ، من شتێکم لە ئێوە ناوێتو ، ئامۆژگاریم بۆ ئێوەیەو ڕزقیشم لەسەر ئێوە نییە

وا دەبینم زانایەکانتان دەڕۆنو نەزانەکانتان فێر نابن ؟!

دەبینم پێشوازیتان کردووە لەو شتەی خوا بووە بە کەفیلتان بۆ دابین کردنی ، وازتان لەوەی هێناوە کەوا فەرمانتان پێدەکات ؟!

وادەبینم کۆدەکەنەوەو ناخۆن !!

دروست دەکەنو تێیدا جێنشین نابن !!

هیوا دەخوازنو پێی ناگەن !!

میللەتەکانی پێش ئێوە کۆیان کردۆتەوەو هیواخواز بوون ...

ئەوەندەی نەبردووە تا ئەوەی کۆیان کردۆتەوە لە دەستیان چووە

هیواکانیان بەسەرچووەو　　ماڵەکانیان بووە بە گۆڕ بۆیان

ئەوە ( عاد ) بوو - ئـەی خـەڵکی دیمەشـق - زەویـان پڕ کردبوو لـە ماڵو منداڵ کێ هەیە پاشماوەی (عاد ) بەدوو درهەم لەمن بکڕێت ؟

خەڵکەکە وایان لێهات دەستیان بە گریان کرد تا لە دەرەوەی مزگەوت خەڵك گوێی لە گریانیان بوو ..

* * *

لەم ڕۆژە ( ابو درادء ) ڕووی دەکردە کۆڕو دانیشتنەکانی خەڵك لە ( دیمەشق )و بە بازارەکـان دەسـوڕایەوە ، وەلامـی پرسـیاری خـەڵکی دەدایـەوەو ، نـەزانی فێردەکردو ، بێئاگای بە ئاگا دەهێنایەوەو ، هەر هەلێکی بۆ برەخسابوایە سوودی لێ وەردەگرتو بە فیڕۆی نەدەدا

جارێکیـان بـەلای کۆمـەڵێك دا تێپـەڕی بینـی وا لـە پیـاوێك دەدەنو جوێنـی پێدەدەن ، چووە لایانو گوتی :- چی ڕووی داوە ؟!

گوتیان :- پیاوێك کەوتۆتە نێو گوناهێکی گەورە

گوتی :- ئەگەر بینیتان کەوتبێتە ناو بیرێکەوە ئایا دەریناهێنن ؟

گوتیان :- بەڵێ

گوتی :- نە جوێنی پـێبدەن و نـە ئازاریشـی بـدەن ، بـەڵکو ئامۆژگـاری بکـەن و ڕێگای پێ نیشان بدەن ، حەمدوسوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەوەی ئێوە نەکەوتوونەتە ناو ئەم گوناهە ...

بە ( ابو درادء ) یان گوت ئایا تۆ ڕقت لێی نابێتەوە ؟!

ئەویش گوتی :-

بەڵکو ڕقم لە کردەوەی دەبێتەوە ئەگەر وازبهێنێت ئەوا برامە . پیاوەکە دەستی بە گریان کردو بڕیاری پاشگەزبوونەوەو تەوبەی دا

ئەمەش گەنجێکە دێتە بەرامبەر ( ابودرادء ) و پێی دەڵێت :-

ئەی یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بکە ، ئەویش گوتی :-

ئەی ڕۆڵەکەم ، یادی خوا بکە لە خۆشی یادت دەکات لە ناخۆشی..

ئەی ڕۆڵەکەم ، زانا بە یان فێرکەر بە یان گوێ بیست بە ، نەبیت بە چوارەمیان بە هیلاك دەچیت

ئەی ڕۆڵەکەم ، مزگەوت ببێت بە ماڵت ، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی { المساجدُ بيتُ كلِّ تقيٍّ }

واتە :- مزگەوت مـاڵی هـەموو لەخواترسـێکە ... خـودای گـەورە دابـین کـاری ئـەو کەسـەیە کـەوا مزگـەوت مـاڵی بێـت ڕەحمـەتی خـۆی بەسـەردا بڕێـژێو بـەختیاری بکاتو ، ئەمە ببێتە ڕێگا خۆشکەرێك بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە ....

* * *

ئا ئەمانـەش چـەند گـەنجێکن دانیشـتوون لەسـەر ڕێگـاو قسـە دەکـەن و تەماشـای خەڵکی تێپەڕ بوو دەکەن ، ( ابو درادء )دەچێتە بەرامبەریانو پێیان دەڵێت :-

ئەی ڕۆڵەکانم ، میحرابی پیاوی موسڵمان ماڵەکەیتی ، دەروون و دەم و چاوی خۆی تێیدا دەپارێزێت ، ئاگادارتان دەکەمەوە دانیشتن لە بازارەکان ئەوا تووشی گوناهتان دەکات و کاتتان بەفیڕۆ دەدات ...

هەروەها لە کاتی جێنشین بوونی ( ابو درداء ) لە دیمەشق فەرمانڕەواکەی ( معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ) دەنێرێتە داخوازی کچەکەی ( ابو درداء ) بۆ یەزیدی کوڕی ، ( ابو درداء ) ڕازی نابێت کچەکەی بداتێ ، بەڵکو دەیدات بە موسڵمانێکی ئاسایی بە دین و ڕەوشتی ڕازی دەبێت .

ئەم قسەیە لەناو خەڵك بڵاو دەبێتەوە ، دەڵێن :-

( یەزیدی کوڕی معاویە ) دەچێتە داخوازی کچی ( ابو درداء ) و باوکی نایداتێ و بەڵکو دەیدات بە موسڵمانێکی ئاسایی

یەکێك پرسیار لە ( ابو درداء ) دەکات دەربارەی ئەم هۆیە :-

ئەویش گوتی :-

من لێم کۆڵیەوە و ئەوەم کرد بۆ چاکی کاروباری ( درداء ) ...

گوتیان :- ئەمە چۆن ؟

ئەویش گوتی :- چ گومان دەبەن بە ( درداء ) ئەگەر لەژێر دەستی خولامەکان و بەندەکان بێن و بچن و خزمەتی بکەن ، خۆی ببینێتەوە لە کۆشکێك چاوی لەبەر بریسکەی مرواری بریسکێتەوە ...

ئەم کاتە ئایینەکەی بۆ کوێ دەچێت ؟

* * *

لەکاتی مانەوەی ( ابو درداء ) لە وڵاتی شام ئەمیری بڕواداران ( عومەری کوڕی خەطاب ) چووە لایان بۆ ئەوەی لە کاروباریان بپرسێتەوە ، لە کاتی شەو سەردانی ( ابو درداء )ی هاوڕێی کرد ، پاڵی بە دەرگاوەنا و ، دەرگا بەبێ سوونگێر بوو ، چووە ژوورێکی تاریك ڕووناکی تیا نەبوو ، کاتێك ( ابو درداء ) هەستی پێکرد بۆی هەڵسایەوە و بەخێرهاتنی کرد و پێی گوت فەرموو دابنیشە

هەردووکیان دەستیان بە قسەکردن کردو ، تاریکی نەیدەهێشت هیچ کامیان ئەوی تر ببینێت . ( ئیمامی عومەر ) دەستی دایە بەرەکەی ( ابو درداء )ی بینی بەرەی کورتانی وڵاخە ... وە دەستی دا جێگای نووستنی بینی بریتییە لە بەرد .. دەستی دا جل و بەرگی بینی جلێکی تەنکە و بەکەڵکی سەرمای ( دیمەشق ) نایەت .

( ئیمامی عومەر ) پێی گوت :-

خوا ڕەحمەت پێ بکات ، ئەی ڕێگام نەدایت ؟! ئایا بۆم ڕەوانە نەکردیت ؟!

( ابو درداء ) گوتی :-

بەیادت نایەتەوە ئەی ( ئیمامی عومەر ) قسەیەك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی کردووین ؟

( ئیمامی عومەر ) گوتی :- ئەم فەرموودەیە چییە ؟

گوتی :- ئایا نەیفەرموو :

{ پێویستی ئێوە لە دونیادا خواردنی ڕێبوارێك بێت } ؟
( ئیمامی عومەر ) گوتی :- بەڵێ ...
ئەویش گوتی :- چی بکەین لەپاش ئەو ئەی ( عومەر ) ؟!!
( ئیمامی عومەر )و ( ابو درادء ) دەستیان کرد بە گریان ... ئەوەندە بە گریانەوە وەڵامی یەکتریان دایەوە تا بەیانی‌یان بەسەردا هات .
( ابو درادء ) لە ( دیمەشق ) مایەوە، ئامۆژگاری خەڵکی دەکردو فێری حیکمەت‌و کتابی خوای دەکردن تا ڕۆژی مردنی .
کاتێك مردنی لێ نزیك بوویەوە ، هاوڕێکانی هاتنە لای و پێیان گوت :-
سکاڵای چی دەکەیت ؟
دەیگوت :- گوناهەکانم .
گوتیان :- حەز لە چی دەکەیت ؟
دەیگوت :- لێبووردنی پەروەردگارم .
پاشان بە ئەوانەی دەوری خۆی گوت :- تەلقینی ﴿ لااله الا اللّه محمد رسول اللّه ﴾م بدەن ، بەردەوام دووبارەی دەکردەوە تا گیانی دەرچوو .

* * *

کاتێك ( ابو درادء ) گەیشت بە پەروەردگاری ، ( عەوف کوڕی مالك ی ئەشجەعی ) - کەوا یەکێك بوو لە یاوەرە سەرەك هۆزە ئازادەکان - لە خەودا باغێکی سەوزی بینی زۆر فراوان بوو سێبەرێکی زۆری هەبوو بە هۆی دارو درەختەکەیەوە ، ( قوبە ) یەکی گەورەی لە پێست تێدا بوو ، ڕانە مەڕێکی یەکجار گەورەی لە دەورە بوو چاو هیچ کاتێك نەیبینی بوو ..
گوتی :- ئەمە بۆ کێیە ؟
پێیان گوت : ئەمە بۆ ( عبدالرحمن کوڕی عەوف )ە .
( عبدالرحمن کوڕی عەوف ) لە ( قوبە )ە کە بەدیار کەوت ، پێی گوت :-
ئەی ( کوڕی مالك ) ، ئەمە بە هۆی قورئان خوای گەورە پێی بەخشین ، ئەگەر ڕوو لەم ڕێگایە بکەیت شتی وا دەبینی ، چاوت شتی وای نەبینیوە ، گوێت لە شتی وا دەبێت بە هیچ جۆرێك گوێت لێی نەبووە ، شتی وا دەبینی ، هیچ کاتێك بەسەر دڵت دا نەهاتوو ...
( کوڕی مالك ) گوتی :-
ئەمە هەمووی بۆ کێیە ئەی باوکی موحەممەد ...؟!
گوتی :- ئەمە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ( ابو درادء ) لەبەر ئەوەی بە هەردوو دەست‌و سینگی‌یەوە پاڵی بە دونیا وەدەناو لە خۆی دوور دەخستەوە
خودای گەورە لە زاناو دونیا نەویستی خواپەرست یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ( باوکی درادء ) ڕازی بێت ، ئێمەی گوناهبار و نەزانیش هیدایەتی ئیسلامی ڕاستەقینە بدات و لەگەڵ ئەم خۆشەویستانەی خۆی حەشرمان بکات ...

* * *

٧٤

# ﴿ أسيدى كوڕى حوضەير ﴾

## باشترین پیاو
## ئوسەیدی کوڕی حوضەیره

( پێغەمبەری خوا ﷺ )

## { ٧٤ }

## ﴿ أسیدی کوڕی حوضـــەیر ﴾

## باشترین پیاو : ئوسەیدی کوڕی حوضـــەیرە

( پێغەمبەری خوا ﷺ )

ئەو گەنجە مەککیەی کەوا جوانترینی گەنجانی مەککەو دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ناوی ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) نێردرا بۆ شاری ( یەثریب ) ، کەوا بە یەکەم نوێنەری مزگێنیدەر دەژمێردرێ لە مێژووی ئیسلام ...

ئەم نوێنەرە لە میوانی ( اسعد کوڕی زورارە ) دابەزی ، کەوا یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی خەزرەج ، ئەمماڵەی کرد بە شوێنی خۆیو ، چەقی بڵاوکردنەوەی بانگەکەی و مزگێنیدانی پێغەمبەرەکەی موحەممەد کوڕی عبداللە ﷺ بە خەڵکی ( یەثریب ) ..

خەڵکی (یەثریب ) بە کۆمەڵ دەهاتن بۆ کۆڕەکانی بانگهێژی لاو ، ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) ، ئەویش بەهۆی قسە شیرینەکانیو ، بەڵگە ئاشکراکانیو ، نەرمی سروشتی و ، ڕوناکی ئیمانی کەوا لە ڕوخسارە جوانو پاکەکەی ڕەنگی دەدایەوە سەرنجی ڕاکێشابوون ..

جگە لەم سیفەتانەش شتێکی تر لە سەرووی هەموویانەوە هەستیانی شەیدا کردبوو ، ئەمەش ئەم قورئانە بوو ناوە ناوە چەند ئایەتێکی پیرۆزی بۆ دەخوێندنەوەو ، دڵە ڕەقەکانی نەرم دەکردنەوەو ، فرمێسکە بەندبووەکانی دەهێنایە خوارەوە ، هەر کۆڕێکیش ببەسترابوایە ئەوا کۆمەڵێکی زۆر پاڵیان ئەدا پۆل باوەڕو موسڵمان دەبوون .

ڕۆژێکیان ( اسعد کوڕی زورارە ) لەگەڵ میوانە بانگهێژەکەی ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) دەچێتە دەرەوە ، بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك لە ( بەنی عبدالاشهل ) ، بانگیان بکرێت بۆ ئیسلام ، هەردووکیان چوونە باغێك لە باغەکانی ( بەنی عبدالاشهل ) ، دانیشتن لەسەر بیرێك لەژێر سێبەری دارخورما .

کۆمەڵێك کۆبوونەوە لە دەورەی ( موصعەب ) و موسڵمان بوون ، هەندێکیشیان دەیانویست گوێ بیست بن ، بۆیان دەردەچوو و بانگی ئیسلامی دەکردن و، خەڵکەکەش بێدەنگ دەبون لە بەرامبەریو ، بەقسە شیرینەکانی بەند دەبوون .

هەواڵ ڕۆیشت بۆ ( ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و سەعدی کوڕی موعاذ ) هەردووکیان گەورەی ( ئەوس ) بوون . کەوا بانگێژی مەککەیی بەم زووانە دابەزیوە لە ناوچەکەیان ، وە ئەو کەسەی ڕێگای پێداون بۆ ئەم کارەی ( اسعد کوڕی زورارە )یە ..

( سەعدی کوڕی موعاذ ) بە ( ئوسەیدی کوڕی حوضەیر )ی گوت :-

ئەی کوڕی پیاوان ( ئوسەید ) ، برۆ بۆ لای ئەم گەنجە مەککی‌یە کەوا هاتووە بۆ ماڵـــەکانمان و ڕەش‌و ڕووتـــەکانمان هەڵدەخەڵـــەتێنێ‌و ، خواکانمـــان ســـووك دەکاو، قەدەغەی بکەو، ئاگاداری بکەرەوە لەوەی لەپاش ئەمڕۆوە پێ نەنێتە خاکمان ..
پاشان گوتی :
ئەگەر لە میوانداری کوڕی خاڵم ( اسعد کوڕی زورارە ) نەبوایـە ، کەوا خـۆی دەردەچێت بۆ پارێزگاری‌کردنی ئەوا من بە تەنها خۆم بۆی دەردەچووم .
( ئوسەید ) دەستی دا (حەربە )کەی‌و بەرەو باغەکە ڕۆیشت ، کاتێك ( اسعد کوڕی زورارە ) بینی ڕووی لە ( موصعەب ) کردو گوتی :-
خاکت بەسەر ئەی ( موصعەب ) ، ئەوە گەورەی میللەتەکەیەتی و ، لە هەموویان ژیرترەو ، لە هەمووشیان ڕێك‌و پێك ترە ( ئوسەیدی کوڕی حوضەیرە ) ...
ئەگەر ئەمە موسڵمان بێت خەڵکێکی زۆر لە دوای ئەم مسوڵمان دەبێت ، باشترین بەڵگەی بۆ بهێنەوە .
( ئوســـەیدی کـــوڕی حوضـــەیرە ) لەســـەر کۆمەڵەکـــە وەســـتاو ، ڕووی لـــە ( موصعەب ) و هاوڕێکەی کردو گوتی :-
چی ئێوەی هێناوە بۆ ناوچەکانی ئێمە ، هەڵخەڵەتاون بە ڕەش‌و ڕووتەکانمان ؟!
ئەم ناوچەیە بەجێ‌بهێڵن ئەگەر نەفسی خۆتان خۆش دەوێت .
( موصعەب ) بە ئێوچەوانە پاکەکەی بە روناکی ئیمان ڕووکلە ( ئوسەید ) کردو ، بە زمانە پاڵاوو شیرینەکەی قسەی لەگەڵ کردو پێی گوت :-
ئەی گەورەی هۆزەکەت ، ئەگەر کارێکی چاکترت پێ نیشان بدەم ؟
( ئوسەید ) گوتی :- ئەم کارە چی‌یە ؟
ئەویش گوتی :-
لە لامان دانیشەو گوێمان لـێ‌بگرە ، ئەگـەر ڕازی بـووی بەوەی دەیڵێین قەبوولی بکە ، ئەگەر پێشی ڕازی نەبووی لە لاتان دەڕۆین‌و ناگەڕێینەوە بۆلاتان ....
( ئوسەیدی کوڕی حوضـەیر ) گوتی :-
بەڕاستی چاکت گوت ، ( حەربە )کەی لە زەوی چەقاندو دانیشت ..
( موصعـەب ) ڕووی تێکـردو ڕاسـتی ئیسـلامی بـۆ ڕوون کـردەوەو ، هـەندێك لـە ئایەتەکانی قورئانی بۆ خوێندەوەو ، ئەمیش دڵ‌و دەروونـی پـێی خـۆش بوو و ، ڕووی گەش بووەوەو گوتی :-
ئەوەی داوای دەکەی زۆر چاکەو ، هیچ شتێك لەمە جوانتر نی‌یە کە دەیخوێنیەوە !!!
ئێوە چی دەکەن ئەگەر ویستتان بێنە ناو ئیسلام ؟!
( موصعەب ) پێی گوت :-
خۆت دەشۆیت‌و جلەکانت پاك دەکەیتەوە ، شاهیدی دەدەی بە ( لا اله الا اللّه محمد رسول اللّه ) و دوو ڕکات نوێژ دەکەیت .

( ئوسەید ) هەڵسا بۆ سەر بیرەکەو خۆی پاك کردەوە بە ئاوەکەی‌و ، شاهیدی ( لا اله الا الله محمد رسول الله ) و دوو ڕکات نوێژی کرد .

لەم ڕۆژەوە ( ئوسەید ) پاڵی‌دا بە پۆلی ئیمانداران ، کەوا یەکێك بوو لە سوارچاکە عەرەبە ناودارەکان و ، یەکێك لە گەورە پیاوانی ئەوس ...

ئەم پیاوە لە نێو میللەتەکەی ناسرا بوو بە ( کامل ) ، لەبەر بیرتیژی و ڕەسەنایەتی‌و ، لەبەر ئەوەی شمشێرو ئەڵەمیشی بەخۆوە گرتبوو ، جگە لە سوارچاکی‌و تیرهاوێشتن ، خوێندەوار بوو لە کۆمەڵگایەك زۆر بە کەمی پیاوێك پەیدا دەبوو خوێندن‌و نوسین بزانێت ...

موسڵمان بوونی ( ئوسەید ) بووە هۆی موسڵمان بوونی ( سەعدی کوڕی موعاذ ) وموسڵمان بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ( ئەوس ) .

ئیتر لەم ڕۆژەوە مەدینە بوو بە مەڵبەندی کۆچ کردنی پێغەمبەر ﷺ ، سەرکردایەتی دەوڵەتی ئیسلامی مەزن .

( ئوسەید ) شەیدای قورئان بوو ، هەر لەم ڕۆژەی گوێی لە ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) بوو هەروەك خۆشەویست بە خۆشەویستەکەیەوە بلکێ ، یان یەکێکی تێنوو بەرەو ئاوێکی شیرین لە ڕۆژێکی ووشك بچێت ، ئەم کارە بووە کاری سەرەکی‌و هەمیشەیی ( ئوسەید ) .

نەتدەبینیەوە تەنها موجاهدێك بوو لە ڕێگای خوا ، یان خۆی تەرخان کردبوو بۆ خوێندنەوەی کتابی خوا ..

( ئوسەید ) پیاوێکی دەنگ پیاوانەو ، زمان پاڵاو بوو ، زۆر بە جوانی قورئانی دەخوێندەوە بە تایبەتی کاتێك شەو تاریکایی دادەکەوت‌و ، چاوەکانی خەویان لێ نەدەکەوت و ، دەروونەکان ئارامیان دەگرت ، ئینجا دڵی بە تەواوی دەچوو بۆ قورئان خوێندن ..

یاوەرە بەڕێزەکان کاتی قورئان خوێندنی ( ئوسەید )یان دیاری دەکردو ، پێشبرکێیان دەکرد لە گوێگرتن لە خوێندنەوەی قورئانەکەی بەدەنگە زوڵاڵەکەی ...

ئینجا بەختیاری بۆ ئەو کەسە بوو گوێی لە دەنگی قورئانەکەی ڕادەگرت‌و ئەوەندە بە تەڕی و ناسکی دەیخوێندەوە دەتگوت تازە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ هەروەها خەڵکی ئاسمانیش تام‌و لەزەتیان لە خوێندنەوەکەی وەردەگرت هەروەك خەڵکی زەوی تامیان لێ‌دەکرد ...

لە نیوەی شەوێك لە شەوان ( ئوسەیدی کوڕی حوضەیرە ) دانیشتبوو لە حەوشی ماڵەکەی ، ( یحیی )ی کوڕی لە لایەك خەوی لێکەوتبوو ، ئەو ئەسپەی ئامادەی کردبوو بۆ جیهاد لە ڕێگای خوا بەسترابووەوە زۆر لێی دوور نەبوو ..

شەو کپ و بێ‌دەنگ بوو ، ئاسمان پاك‌و بێ‌گەرد بوو ، ئەستێرەکان بە سۆزەوە ڕوویان لە زەوی کردبوو

دەروونی ( ئوسەیدی کوڕی حوضـەیرە ) جۆشیدا ئەم ئاووهەوا پاكو بێگەردە بۆن خۆش بکات بە خوێندنەوەی قورئان ، دەستی پێکرد بە دەنگە پڕ لە زوڵاڵەکەی :-

﴿ الم ذلك الكتاب لا ريب فيه هدى للمتقين ، الذيـن يؤمنـون بـالغيب و يقيمـون الصلاة ومما رزقناهم ينفقون ، والذين يؤمنون بما أنزل اليـك ومـا انـزل مـن قبلـك و بالآخرة هم يوقنون ﴾ .

لـە کاتێکدا گوێی لـێبوو ئـەوەندەی مـابوو ئەسـپەکەی جڵـەوی بپسـێنێ بـە هـۆی سوڕانەوی جارێك بە دەوری خۆی دا ، لە قورئان خوێندن بێدەنگ بوو ، ئەسپەکەی لـە جێی خۆی وەستاو ئارامی گرت

گەڕاوە دووبارە خوێندیەوە :-

﴿ اولئـك علـى هــدى من ربهــم و أولئـــك هــم الـمفلحـون ﴾

جارێکی تر ئەسپەکەی دەورەیەکی تری لێدا لە جاران بەهێزتر .

لە خوێندن وەستا

ئەسپەکەی ئارامی گرت ..

ئەوەی چەند جار دووبارە کردەوە ، هـەر کـە قورئـانی دەخوێنـدەوە ئـەوەندەی دەما ئەسپەکەی هارو شێت ببێت ، کاتێك دەوەستا ئەویش ئارامی دەگرت ..

لەمە ترسا نەوەك ئەسپەکە بەسەر (یحیی ) بکەوێت ، بۆی چوو بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە لێرەدا سەری بڵند کرد بۆ ئاسمان ، هەوری دەبینی وەکو چەتر ، چاو شتی وا جوان و سەرسـوڕهێنەری بەخۆیـەوە نـەبینیبوو بـە ئاسمانـەوە وەکـو گڵـۆپ هەڵواسـرا بوو ، ئاسۆی پڕ کردبوو لە جوانی و ڕوناکی ، پاشـان بۆ ئاسمـان بـەرز بووەوە تـا لـەبەر چاو بزر بوو . کاتێك بـەیانی داهـات ڕۆیشـت بۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ، ئـەم هەواڵـەی بـۆ گێڕایـەوە کـەوا بـە چـاوی خـۆی بینیبـووی ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێی فەرموو :-

(( تلك الملائكة كانت تستمع لك يا أسيد ولو أنك مضيت في قراءتـك لرآهـا الناس تستتر منهم ))

واتـە : ئەمانـە فریشتە بوون گوێیا لێت گرتووە ئـەی ( ئوسەید ) ... ئەگەر تـۆ لـە خوێندنەوەکەت بەردەوام بوایت ، دەتبینی خەڵك خۆیان لـێی دەشارنەوە )

هــەروەك ئــەوەی ( ئوســەید )بــە قورئــان لکــابوو بـــە پێغەمبـــەری خـــواش لکابوو ﷺ ، - هەروەك - باسی دەروونی خۆی دەکا ، هەر کاتێك پلەی ئیمـانم بـەرز و دڵـم پـاك دەبـۆوە کـاتێك قورئـانم دەخوێنـدەوە یـان گوێـم لـێدەبوو - یـاخود کـاتێك تەماشای پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد کاتێك قسەی دەکرد یان وتاری دەدا

زۆر جـاران ( ئوسـەید ) تەمـەننای ئـەوەی دەکـرد و هیواخـواز بـوو جەسـتەی بـە جەستەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێت و بۆی نزم بێتەوەو ماچی بکات

جارێکیان ئەم دەرفەتەی بۆ ڕەخسا

ڕۆژێکیان ( ئوسەید ) بە قسە خۆش و دڵ خۆشکەرەکانی قسەی دەکرد بۆ میللەتەکەی ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی پیرۆزی دەستێکی وەنا بە نێوان ناوک و بن هەنگڵی ، هەروەکو بڵێیت قسەکانی پێ خۆش بێت ..

( ئوسەید ) گوتی :- ئازارت دام ئەی پێغەمبەری خوا

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- تۆڵەم لێبکەرەوە ئەی ( ئوسەید ) .

( ئوسەید ) گوتی :- تۆ کراسێکت لەبەرە من کراسم لەبەردا نەبوو ئەو کاتەی ئەم دەستەت بۆ هێنام ..

پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی لەسەر جەستەی بڵند کرد ، ( ئوسەید ) باوەشی پێداکردو نێوان بن هەنگڵ و ناوکی ماچ کردو گوتی :-

دایک و باوکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەمە مەرقێک و ئارەزوویەک بوو هەر لەم کاتەی تۆم ناسی ، ئێستا پێی گەیشتم .

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستی لە دڵ لەگەڵ ( ئوسەید ) دەگۆڕیەوەو ، هەروەکو یاوەرێکی دێرین لە ئیسلام تەماشای دەکرد ، ئەویش لە ڕۆژی ئوحد حەوت برینی سەختی لە جەستەی بوو لە ئەنجامی بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ ..

هەروەها پلەوپایەی ( ئوسەید )ی دەزانی لەناو میللەتەکەی ، ئەگەر بەرگری بکردبا لە یەکێک ئەوا بەرگری لە ( ئوسەید ) دەکرد ..

( ئوسەید ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت :-

چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ماڵێکی هەژارم کرد بۆی لە ئەنصارییەکان ، زۆربەی ئەم ماڵە ئافرەت بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

ئەی ( ئوسەید ) هاتی بۆ لامان پاش ئەوەی ، ئەوەی لە لامان بوو بەخشیمان ، ئەگەر گوێت لێبوو بە شتێک بۆمان هات ئەم ماڵەمان بە یاد بهێنەوە ..

پاش ئەمە ماڵێکی زۆری لە ( خەیبەر ) بۆ هات دابەشی کرد لە نێوان موسڵمانان زۆربەی دا بە ئەنصارەکان ، ماڵێکی زۆریشی دا بەم ماڵە ، پێم گوت :-

خوا پاداشتی خێرت بداتەوە بۆیان - ئەی پێغەمبەری خوا - بە چاکە .

ئەویش فەرمووی :-

ئێوەش ئەی کۆمەڵی ئەنصار خوا باشترین پاداشتان بداتەوە ، ئێوەم - ناسیووە - دەستپاک و بە ئارام بوون ، ئێوە بێبەش دەبن لە ڕۆژێکدا هەبوون دەبێت ، ئارام بگرە تا دەگەی بە من ، جێگاشمان حەوزی کەوثەر دەبێت .

( ئوسەید ) دەڵێت :-

کاتێک ( عومەری کوڕی خەطاب ) - خوا لێی ڕازی بێت - جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست ، ماڵ و کەلوپەلی بەسەر موسڵمانان دا دابەش کرد ، جلێکی بۆ من ڕەوانە کرد پێم بچووک و کەم بوو ، لە مزگەوتدا گەنجێکی قوڕەیشی بەلام دا تێپەڕی جلێکی گەورەو فراوانی لەبەر بوو لەم جلوبەرگانەی ( عومەری کوڕی خەطاب ) بۆ منی ڕەوانە کرد بوو ، ئەم پیاوە کراسەکەی لەسەر زەوی لە دوای خۆی ڕادەکێشا ، بۆ ئەوانەی

لەگەڵم بوون ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوام ﷺ بەیاد هاتەوە ( ئێوە بێبەش دەبن لە ڕۆژێکدا هەبوون دەبێت ) گوتم :-

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستی فەرمووە . پیاوێك چووە لای ( ئیمامی عومەر ) و ئەم هەواڵەی پێدا کەوا من چیم گوتوە ، ( ئیمامی عومەر ) بە پەلە هات بۆ لام و من نوێژم دەکرد گوتی :-

نوێژ بکە ئەی ( ئوسەید ) .

کاتێك نوێژەکەم تەواو کرد ڕووی تێکردمو گوتی چیت گوتوە ؟

منیش ئەوەی گوتبوم و بینیبووم پێم گوت

( ئیمامی عومەر ) گوتی :-

خوا عەفوت بکات ، ئەم جلەم بۆ فلان کەس ڕەوانە کردووە ، ئەم پیاوە ئەنصاریو عەقەبیو بەدریو ئوحدییە ، ئەم گەنجە قورەشییە لێی کڕیوەو لەبەری کردووە

ئایا گومانت برد ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوە لە زەمانی من ڕووی داوە ؟

( ئوسەید ) گوتی :-

سوێند بەخوا ئەی ئەمیری بڕواداران منیش گومانم دەبرد ئەم شتە لە زەمانی تۆ نابێت ( ابن مالك ) دەگێڕێتەوە دەڵێت :-

( ئوسەیدی کوڕی حوضەیرە ) و ( عەباد کوڕی بشیر ) لە شەوێکی زۆر تاریك لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەبن ، گفتوگۆی لەگەڵ دەکەن تا دەیانەوێ بڕۆن گۆپاڵی یەکێکیان ڕوناکییان دەداتێ و لە ژێر ڕوناکی ئەم گۆپاڵە دەڕۆن کاتێك دەیانەوێ لە یەکتر جیا ببنەوە گۆپاڵی هەر یەکێکیان ڕوناك دەبێتەوەو ڕێگایان بۆ ڕوناك دەکاتەوە

لە ساڵی بیستی کۆچی ، لە خەلافەتی ( ئیمامی عومەر ) - خوا لێی ڕازی بێت - ( ئوسەید ) لە مانگی شەعبانی ئەم ساڵە گیانی پاکی شاد دەبێت بە خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو پەروەردگار کۆچ دەکات ...

پاش ئەوەی کۆچی دوایی دەکات قەرزێکی لەسەر دەبێت بڕی ( چوار هەزار ) درهەم دەبێت میراتگرەکانی دەیانەوێت زەوییەکەی بۆ بفرۆشن لەبەر وەفایان بۆ قەرزەکە ، کاتێك ( ئیمامی عومەر ) بەمە دەزانێت و دەڵێت :-

ناهێڵم نەوەی برام لەسەر خەڵك بژین ...

پاشان قسە لەگەڵ قەرزدەرەکان دەکاتو ڕازی دەبن کەوا بەروبوومی چوار ساڵی ئەم زەوییە ببەن ، هەر ساڵێ هەزار درهەم .

*　　　*　　　*

٧٥

## رەبیعەی کوڕی کەعب

# ئەو کەسەی بۆ خوا بوو
# دونیاو قیامەتی بوو

## { ٧٥ }

## ﴿ ڕەبیعەی کوڕی کەعب ﴾

## ((ئەو کەسەی بۆ خوا بوو دونیاو قیامەتی بوو))

( ڕەبیعەی کوڕی کەعب ) دەڵێت :

من گەنجێکی تەمەن تازە بووم کاتێك دەروونم بە ڕوناکی ئیمان ڕوناك بۆوەو ، دڵم پڕ بوو بە واتای ئیسلام ...

کاتێك چاوەکانم ڕوون بۆوە بە دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یەکەمین جار ، خۆشەویست بە خۆشەویستیەك هەموو ئەندامەکانی لەشی گرتمەوە

بە جۆرێکی وا شەیدای بووم بێجگە لە ئەو وازم لە هەموو شتێك هێنا ...

ڕۆژێك لە دڵی خۆم دا گوتم :-

خاکت بەسەر ئەی ( ڕەبیعە ) ، بۆچی خۆت تەنها ناکەیت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ برۆ ئەم کارەی پێشنیار بکە ...

ئەگەر پێت ڕازی بوو بە نزیك بوونەوەی بەختیار دەبیت و بە خۆشەویستی ئەو سەرکەوتوو دەبیت و بە بەرەکەتی ئەو دونیاو قیامەتت دەبێت ..

پاشان ئەوەندەی پێ نەچوو خۆم پێشنیار کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ، تکام لێ کرد قەبووڵم بکات بە خزمەتکردنی ....

ئەویش تکاکەی ڕەت نەکردمەوەو ، ڕازی بوو بەوەی ببم بە خزمەتکاری .

ئیتر لەم ڕۆژەوە ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری بەڕێزو هەروەك سێبەر لێی جوێ نەبوومەوە بۆ کوێ بڕۆیشتبا دەڕۆیشتم لەگەڵی ، لە ئاسۆی دەسووڕامەوە چۆن بسوڕابایەوە .

هەر جارێك بەرامبەر من ، تیچاوێکی بدابایە ، ئەوا دەیبینی من لەژێر دەستی وەستاوم ...

هەر کاتێك پێویستی‌یەکی هەبووایە ئەوا دەیبینی من بە پەلە کارەکەی بۆ ئەنجام دەدەم ، من بە درێژایی ڕۆژ خزمەتم دەکرد ، کاتێك ڕۆژی تەواو دەکردو نوێژی عیشای دەکردو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، منیش لێی جیادەبوومەوە .

بەڵام زۆر نەمامەوەو لە دڵی خۆم دا گوتم :

بۆ کوێ دەچیت ئەی ( ڕەبیعە ) ؟ !

لەوانەیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا پێویستی‌یەکی هەبێ پێت ...

لە پێش دەرگاکەی دانیشەو پێش دەرگای بەرمەدە ..

پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەوی بە نوێژکردن دەبردە سەر ، لەوانەی کەوا گوێم لێ بوو سورەتی ( فاتحە )ی دەخوێندەوە ، تا نیوەی شەو ئەمەی دووبارە دەکردەوە تا وام لێ هات وازی لێ بهێنم ، یان خەو لە چاوەکانم نەکەوێت

لەوانەی گوێم لێ ی دەبوو دەیگوت : ﴿ سمع اللّه لمن حمده ﴾ لەم کاتەدا ماوەی چوونی بۆ رکوع و سوجدە زیاتری لە سورەتی فاتحە دەخایاند

یەکێك لە نەریتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو هەر یەکێك چاکەیەکی لەگەڵ کردبا ئەوا حەزی دەکرد لەم چاکەیە زیاتر پاداشتی بداتەوە ..

لەبەر ئەوە حەزی کرد پاداشتم بداتەوە لە جیاتی ئەم خزمەت کردنە ، ڕۆژێك ڕووی تێکردمو فەرمووی : ئەی ( ڕەبیعەی کوڕی کەعب )

گوتم : گوێڕایەڵم و خودا بەختەوەرت بکات پاش ئەوەی بەختەوەری کردی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرمووی :- داوای شتێکم لێبکە بۆ ئەوەی بتدەمێ

کەمێك دامامو پاشان گوتم :-

ماوەم بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بیربکەمەوە چیت لێ داوا بکەم ، پاشان پێت دەڵێم ... فەرمووی :- بیربکەرەوە

من لەم ڕۆژگارەدا گەنجێکی هەژار بووم نە ماڵم هەبوو نە منداڵو نە جێگا ، جێگام لەگەڵ کۆمەڵی ( صُفَّة ) بوو لە مزگەوت لەگەڵ نموونەی خۆم لە هەژارە موسڵمانەکان ...

خەڵك پێیان دەگوتین : ( میوانی ئیسلام ) ..

ئەگەر یەکێك ( صەدەقە ) یەکی بهێنابا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەر هەمووی بۆ ئێمە ڕەوانە دەکرد ..

ئەگەر یەکێك دیاریەکی بۆ بهێنابا هەندێکی لێ دەگێڕایەوەو ، ئەوی تری هەمووی بۆ ئێمە ڕەوانە دەکرد ، دەروونم پێی گوتم کەوا داوای شتێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم لە هەموو دونیا چاکتر بێت ، لەم هەژارییە ڕزگاریم بێت ، هەروەکو ئەوانی تر ببم بە خاوەن ماڵو خێزانو منداڵ ...

بەڵام ئەوەندەی نەبرد گوتم :

داوەشێی ئەی ( ڕەبیعەی کوڕی کەعب ) ، دونیا دێو دەڕوا ، ڕۆزیەکەت هەیە تێیدا خوا دابین کارە بۆت ، ئەوا هەر بۆت دێت ...

وە پێغەمبەری خوا ﷺ پلەوپایەیەکی وای هەیە لای خوا هەر داوایەك بکات ڕەت بوونەوەی بۆ نیە .

داوای ئەوەی لێبکە گەورەی ئاخیرەت لە خوا داوا بکات

بەمە دڵم داکەوتو ، ئارامم گرت

پاشان چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

چیت گوت ئەی ( ڕەبیعە ) ؟!

گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا داوات لێ دەکەم دوعام بۆ بکەی ببم بە هاوڕێت لە بەهەشت .

پێغەمبەر فەرمووی :- کێ ئەم ئامۆژگارییەی فێر کردیت ؟

گوتم :-

سوێند بەخوا کەس ئەم ئامۆژگاری‌یەی نەکردووم ، بەڵام ئەم کاتەی بەمنت گوت ، لێم داوا بکەو پێت ببەخشم دەروونم پێی گوتم شتێکت لێ داوا بکەم باشتر بێت لە دونیا

پاشان ئەوەندەی نەبرد دەروونم ئاخیرەتی هەڵبژارد بەسەر دونیاو ، داوام لێ‌کردی دوعام بۆ بکەیت کەوا من ببم بە هاوڕێت لە بەهەشت ..

پێغەمبەری خوا زۆر بێ دەنگ بوو پاشان فەرمووی :-

بێجگە لەمە چیترت دەوێت ئەی ( ڕەبیعە ) ؟!

گـــوتــم :-

نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتەی لێم داوا کردیت هیچ شتێك وەك ئەو نیە .

فەرمووی :- کەواتە یارمەتی خۆت بدە بە سوجدە زۆر بردن ..

لە پاشان خۆم زۆر ماندوو دەکرد بۆ ئەوەی بەم بەختەوەری‌یە بگەم ببم بە هاوڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەهەشت ، هەروەك بەختەوەر بووم بە خزمەتکردنی و هاوڕێی لە دونیا

پاشان ئەمە ماوەیەکی زۆری نەبرد تا جارێکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردمو فەرمووی :-

ژن ناهێنی ئەی ( ڕەبیعە ) ؟!

گوتم : حەز ناکەم لە خزمەت کردنی تۆ شتێك خەریکم بکات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ... پاشان بۆ جاری دووەم منی بینی و فەرمووی :-

ژن ناهێنی ئەی ( ڕەبیعە ) ؟!

هەروەك جاری جاران وەڵامم دایەوە

بەڵام پاش ئەوەی لەگەڵ دەروونی خۆم دوام تا لەسەر ئەمە پەشیمان بوومەوەو گوتم :-

خاکت بەسەر ئەی ( ڕەبیعە ) ....

سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆ چاکتر کاروباری دین و دونیات دەزانێ و ، دەزانێ چی لە لای تۆ هەیە .

سوێند بەخوا جارێکی تر پێغەمبەری خوا بانگم بکات بۆ ژن هێنان گوێ‌ڕایەڵی دەکەم ....

لەسەر ئەمە کاتێکی زۆری نەبرد تا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم :-

ژن ناهێنی ئەی ( ڕەبیعە ) ؟!

گوتم :- بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

بەڵام کێم بۆ دەهێنیت ، منیش وەکو تۆ بزانم ؟!

فەرمووی : بڕۆ ماڵی فلانە کەس و پێیان بڵێ :-

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێ‌دەکات فلانە کچی خۆتانم بدەنێ

بە شەرمەوە چوومە لایان و پێم گوتن :- پێغەمبەری خوا ﷺ منی ڕەوانەی لاتان کردووە بۆ ئەوەی فلانە کچی خۆتانم بدەنێ ...

گوتیان : فلانە کچ ؟!

گوتم : بەڵێ ..

گوتیان : پێغەمبەری خوا ﷺ بەخێر بێتو ، نێردراوی پێغەمبەری خواش بەخێر بێت

سوێند بەخوا نابێت نێردراوی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێتەوە تەنها بە پێویستیەکەی نەبێت ( عەقد ) یان لەسەر ئەمە بۆ کردم .

چوومەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێم گوت :-

ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی چوم بۆ لای باشترین ماڵ ..

پێیان بڕوا کردمو بەخێرهاتنیان کردمو ، ( عەقد) یان کرد لەگەڵم لەسەر کچەکەیان ئینجا لە کوێ مارەییان بۆ بهێنم ؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ( بورەیدەی کوڕی خەصیب )ی کرد - یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی میللەتەکەم ( بەنی أسلم ) پێی فەرموو :-

ئەی ( بورەیدە ) ، کێشی دەنکە خورمایەك زێڕ کۆبکەنەوە بۆ ( ڕەبیعە )

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم :-

بڕۆ بەمە بۆ لایانو ، پێیان بڵێ : ئەمە مارەیی کچەکەتانە ، بردم بۆیانو ، وام بە ماڵەکە گوتو قبوڵیان کردو ، ڕازی بوونو گوتیان :- زۆرەو پاکە

چوومەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، گوتم :-

کەسم نەدیووە وەکو ئەمانە بەڕێز بێت ، ڕازی بوون بەوەی پێم بەخشین - لەسەر کەمی - گوتیان :- زۆرەو پاکە .

ئەی لە کوێ ( وەلیمە )یان بۆ بکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟!

پێغەمبەر بە ( بورەیدە)ی فەرموو :-

بە گوێرەی بەرانێك پارە بۆ ( ڕەبیعە ) کۆبکەنەوە ، بەرانێکی گەورەی قەڵەویان بۆ کڕیم ...

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم :-

بڕۆ لای ( عائیشە )و ، پێی بڵێ هەرچەند جۆی لە لایە با پێت ببەخشێت ، چوومە لایو گوتی :- ئەو زەمبیلە بگرە حەوت ڕوبە جۆی تیایە ، سوێند بەخوا لەم خواردنە زیاتر چیترمان نیە

بە بەرانەکەو جۆیەکە چوومە ماڵی خەزوورم و گوتیان :-

هەرچی جۆیەکەیە ئێمە ئامادەی دەکەین ..

بەڵام بەرانەکە فەرمان بدە بە هاوڕێکانت بۆت ئامادە بکەن .

بەرانەکەم بردو ، - منو هاوڕێکانم - کوشتمانەوەو سوورمان کردەوە ، گۆشتو نانمان بوو ..

وەلیمەم کردو پێغەمبەری خوام ﷺ دەعوەت کرد ، ئەویش هات بۆ دەعوەتەکەم .

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ زەویەکی لە تەنیشت زەوی ( ئیمامی ئەبوبەکر ) پێ بەخشیم ، کەوتمە ناو دونیا ، تا لەگەڵ ( ئیمامی ئەبوبەکر ) لەسەر دارخورمایەك لێم بووە کێشەو گوتم :- ئەم دارە لەناو زەوی منە ...

ئەویش گوتی :- بەڵکو لەناو زەوی منە ...
کێشەم کرد لەگەڵی و ، گوێم لێبوو قسەیەکی کرد دڵم پێی گران بوو
کاتێك ئەم ووشەیەی لێ بەدیار کەوت لێی پەشیمان بۆوەو گوتی :-
ئەی ( ڕەبیعە ) وەکو خۆی پێم بڵێەوە تا ببێتە تۆڵە
گوتم :- نەخێر سوێند بەخوا نایکەم .
گوتی :- کەواتە دەچمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سکاڵا دەبەمە لای لەبەر ئەوەی تۆڵە لەمن ناکەیتەوە
ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا و منیش بەدوایدا ڕۆیشتم
هۆزەکەم ( بەنی اسلم ) بەدوام دا هاتن و گوتیان :-
ئەو لە سەرەتا لەگەڵی کردی و قسەی پێگوتی ، پاشان بە پێش تۆ کەوت ، بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سکاڵای لێکردیت ؟!!!
ئاوڕم لێیان دایەوەو گوتم :- خاکتان بەسەر نازانن ئەمە کێیە ؟!
ئەوە ( صــــدیــــق )ە
خاوەن ریش سپی موسڵمانان بگەڕێنەوە پێش ئەوەی بتان بینێت ، وا گومان ببات ئێوە هاتوون بۆ یارمەتی من و ، تووڕە ببێت ، بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، پێغەمبەر ﷺ تووڕە ببێ و بە تووڕەیی ئەو ، خواش تووڕە ببێت بە تووڕەیی ئەو ( ڕەبیعە )ش بە هیلاك بچێت ، ئەوانیش گەڕانەوە
پاشان ( ئیمامی ئەبوبەکر ) چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، قسەکەی وەکو خۆی بۆ کرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بەرز کردەوە بۆ من و فەرمووی :-
ئەی ( ڕەبیعە ) چیتە لەگەڵ ( صەددیق ) ؟!
گــوتــم :-
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لەمن کرد ئەوەی بە منی گوتووە ئەوەی پێ بڵێم منیش نەمکرد
- فەرمووی :- ئەوەی پێ مەڵێ کە پێی گوتیت .
بەڵکو بڵێ :- خودا لە ( ئەبوبەکر ) خۆش بێت .
منیش گوتم :- خوا لێت خۆش بێت ئەی ( ئەبوبەکر )
بەم جۆرە مایەوەو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و دەیگوت :-
خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی ( ڕەبیعەی کوڕی کەعب )
خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی ( ڕەبیعەی کوڕی کەعب )
خودای گەورە لە ( ئیمامی ئەبوبەکر ) و یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بێت و لە ئێمەی گوناهبارو کەم کردەوەش خۆش بێت و لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرە بەڕێزەکانی لە بەهەشتی فیردەوس شادمان بکات ( ئامین ) .

*　　　　*　　　　*

# ٧٦

## ﴿عبداللّه ی کوڕی أم مكتوم﴾

ئەم یاوەرەی ، خوای گەورە دەرهەقی گازاندەی لە خۆشەویستەکەی کرد

# {٧٦}

# ﴿ عبداللەی کوڕی أم مکتوم ﴾

## ئەم یاوەرەی ، خوای گەورە دەرهەقی ، گازاندەی لە خۆشەویستەکەی کرد

کێ بوو ئەم یاوەرەی دەرهەقی گازاندە کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەوت چینی ئاسمانەکان بە توندترین گازاندە ؟!!!

کێیە ئەم یاوەرەی کەوا دەرهەقی جوبرائیل لە لایەن خوا نیگای هێنا خوارەوە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی ؟!

ئەم یاوەرە بەڕێزە بانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ ( عبداللّەی کوڕی اُمّ مەکتوم )ە

( عبداللّەی کوڕی اُمّ مەکتوم ) خەڵکی مەککەو قورەیشی‌یە خزمایەتی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبەستێتەوە ، دەکاتە کوڕە خاڵی دایکی بڕواداران ( خەدیجەی کچی خوەیلید ) – خوا لێیان ڕازی بێت –

باوکی ناوی ( قەیس کوڕی زائد )ە ، هەرچی دایکیەتی ناوی ( عاتکەی کچی عبدالله )یە ، ناسراوە بە ( أم مکتوم ) لەبەر ئەوەی دایکی بە کوێری لە دایکی بووە

( عبداللّەی کوڕی اُمّ مەکتوم ) تیشکی ڕوناکی لە مەککە بە دڵی خۆی بینی‌و ، خوای گەورە دەروونی بە ئیمان جۆش داو ، یەکێك بوو لە پێشەنگە موسڵمانەکان

( عبداللّەی کوری اُمّ مەکتوم ) لە ناخۆشی موسڵمانان لە مەککە بەشدار بوو بە هەموو قوربانی‌و خۆڕاگری و ئارام گرتنێك

هەروەك موسڵمانانی تر تووشی ئازاری قورەیش بوو ، خوای گەورە تاقیکردەوە بە هەموو توندی ستەمی قورەیش ، بەڵام ئەمە نە لاوازی کردو نە ورەی پێ بەرداوە نە ئیمانی بێ هێز کرد ، بەڵکو زیاتر وای‌کرد دەست بگرێت بە ئایینی خواو بلکێت بە کتابی خواو ، شارەزا بێت لە شەرعی خواو زیاتر پێشوازی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات

ئەوە بوو گەیشت بە پێشوازی پێغەمبەری بەڕێزو سوور بوو لەسەر لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ، وای لێهات بە هیچ جۆرێك هیچ دەرفەتێکی لە دەست نەدەداو ، ئەوا بە پەلە بۆی بچێت ، بەڵکو بە هۆی ئارەزووی لەم کارەوە زیادە ڕەویشی لەم کارە دەکرد پاش ئەوەی بەشی خۆی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەردەگرت

پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ماوەیەدا زۆر ڕووبەڕوو دەبۆوە لەگەڵ گەورەکانی قورەیش ، زۆر سوور بوو لەسەر موسڵمان بوونیان ، ڕۆژێکیان دەگات بە ( عوتبەی کوڕی ڕەبیعە ) و براکەی ( شەیبەی کوڕی ڕەبیعە ) و ( عەمرو کوڕ ، هیشام ) ناسراو بە ( ابو جهل ) و ( ئومەیی کوڕی خەلەف ) و ( وەلیدی کوڕی موغەیرە ) ، باوکی شمشێری خوا ( خالید ) ، لەگەڵیان دەستی کرد بە گفتوگۆ و قسەکردن و ئیسلامی پێشنیار دەکردن ، هیوای وابوو موسڵمان بن ، یان دەست هەڵبگرن لە ئازاردانی یاوەرەکان

ئەو لەم بارودۆخە بوو ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) هاتە لای و ئایەتێك لە ئایەتەکانی خوای گەورەی بۆ خوێندەوەو گوتی :-

– ئەی پێغەمبەری خوا ، فێرم بکە لەمەی خوا فێری کردوویت

پێغەمبەری بەڕێز پشتی تێکردو ، رووی لێ گرژ کرد ، ڕووی کردەوە گەورە پیاوانی قورەیش ، هیوای وابوو موسڵمان بن و ، موسڵمان بوونەکەیان ببێتە هۆی سەربڵندی ئایینی خواو ، لایەنگیری بۆ بانگی پێغەمبەرەکەی

هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم گفتوگۆیە بۆوەو ئەوانی بەجێهێشت و ویستی بگەڕێتەوە بۆماڵەوە تا خوای گەورە هێزی لە چاوی گرتەوەو ، هەستی کرد هێزێك دەکەوێتە سەر سەری و پاشان ئەمەی بۆ هاتە خوراەوە ، کەوا دەفەرموێت :-

﴿ عَبَس وَ تَوَلّى أنْ جاءَهُ الاعمى ، وَمَا يُدريكَ لَعلَّهُ يزَّكّى ، أوْ يذّكّر فتنفعُهُ الذّكرى ، أمّا مَن اسْتغنى فأنت لَهُ تصَّدى ، وما عليك ألاّ يزَّكّى ، و أمّا مَنْ جاءَكَ يَسعَى ، وَهُوَ يَخشَى ، فأنت عَنْهُ تلَهَّى ، كلاّ إنَّها تَذكِرةٌ ، فمن شَاءَ ذَكَرهُ ، في صُحُفٍ مُكَرَّمَةٍ ، مَرفُوعةٍ مُطَهَّرةٍ ، بأيْدي سَفَرةٍ ، كِرامٍ بررةٍ ﴾...

شازدە ئایەت جوبرائیل بۆ سەر دڵی پێغەمبەری بەڕێز هێنا خوارەوە دەرهەق بە ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) ، لەم ڕۆژەی هاتۆتە خوارەوە دەخوێنرێتەوە تا ئەمڕۆ ، وە دەشخوێنرێتەوە تا بەندە پیاوچاکانی خوا میراتگری پێغەمبەرەکەیان بن لەسەر زەوی

لەم ڕۆژەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یادی نەچوو بەڵکو ڕێزی لە پلوپایەی ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) دەناو ، ئەگەر هاتبا ناو مەجلیسەکانی لە خۆی نزیك دەکردەوەو ، کاروباری بۆ جێبەجێ دەکردو پرسیاری لێ دەکرد ئەگەر پێویستییەکی هەبوایە

ئەمەش جێی سەرسوڕمان نیە ، ئەم پیاوە بوو کەوا لە دووری حەوت ئاسمانەوە بە توندترین شێوە دەرهەقی گازاندە کرا لە پێغەمبەرەکەی کاتێك ئازاری قورەیش لەسەر موسڵمانان توند بوو خوای گەورە ڕێگای موسڵمانانی دا بۆ کۆچ کردن ، ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) لە هەموو هاوڕێکانی خێراتر وڵاتی بەجێهێشت لەگەڵ ( موصعەبی کوری عومەیر ) یەکەم یاوەر بوون لە یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتنە شاری مەدینە

( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) گەیشتە ( یەثریب ) لەگەڵ هاوڕێکەی ( موصعەبی کوری عومەیر ) دەستیان کرد بە خەڵك فێرە قورئان کردن و ، شارەزاکردنیان لە ئایینی خوا

ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) و ( بیلال کوری رباح )ی کرد بە دوو بانگدەری موسڵمانان بە ئاشکرا هەموو ڕۆژێك پێنج جار وشەی یەکتاپەرستییان بانگ دەکرد ، خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ باشترین کردەوەو ، هانیان دەدان بۆ سەرکەوت ، هەندێك جار ( بلال ) بانگی دەداو ( عبداللەی کوری اُمّ مەکتوم ) قامەتی دەکرد ، جار وا هەبوو ( کوری ام مەکتوم ) بانگی دەداو ( بلال ) قامەتی دەکرد

هەروەها لەکاتی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ( بلال )و ( کوڕی ام مکتوم ) کارێکی تریان هەبوو موسڵمانان لە مەدینە پارشێویان بە بانگی یەکێکیان دەکردو بە ئەوی تریان بەڕۆژوو دەبوون ...

( بلال ) بە شەو بانگی دەداو خەڵکی بە ئاگا دەهێنا ، ( کوڕی ام مکتوم ) چاوەڕێی بانگی بەیانی دەکردو بەبێ ئەوەی هەڵە بکات

یەکێك لەم ڕێزلێنانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ( کوڕی ام مکتوم ) ئەوە بوو لە شوێنی خۆی دادەنا لەسەر مەدینە کاتێك دە ڕۆژ بۆ کاری خۆی ڕۆیشت ئەمە جارێکیان ، جارێکی تریش ئەم کاتە بوو کەوا ڕۆیشت بۆ فەتحی مەککە ...

لە دوای جەنگی ( بەدر ) خودای گەورە چەند ئایەتێکی ڕەوانەی سەر پێغەمبەرەکەی کرد سەبارەت بە پلەوپایەی موجاهیدان و ، بەرزی کردنەوە لەسەر دانیشتووەکان بۆ ئەوەی موجاهیدان زیاتر وره بەرز بن بۆ جیهادو ، دانیشتووش هان بدات واز لە دانیشتن بهێنن و ، ئەم شتە کاری کردە سەری دەروونی ( کوڕی ام مکتوم )و پێی ناخۆش بوو بێبەش بێت لەم گەورەییە ، گوتی

– ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە توانام هەبوایە جیهادم بکردبایە جیهادم دەکرد ، پاشان بە دڵێکی لەخواترسانەوە داوای لە خوا کرد ئایەت بهێنێتە خوارەوە دەربارەی ئەمو هاوشێوەکانی ئەوانەی کۆسپێك و پاساوێکیان هەیە بۆ جیهاد کردن ، وای لێهات بە پەرۆشەوە دوعا بکاو ، بڵێت :–

(( پەرومردگارا پاساوم ئاشکرا بکە پەروەردگارا پاساوم ئاشکرا بکە ))

* * *

( زەیدی کوڕی ثابت ) نووسەری نیگای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت :

– من لە تەنیشت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم ، نیگای بۆ هات و لەشی تێك چوو ، ڕانی لەسەر ڕانی من دانابوو ، هیچ شتێکم نەبینی گرانتر بێت لە ڕانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، پاشان نیگاکەی لەسەر لا کەوت و ، فەرمووی بنووسە ئەی ( زەید ) ، منیش نووسیم :–

﴿ لا يستوى القاعدون من المؤمنين و المجاهدون في سبيل اللّه ﴾

( کوڕی ام مکتوم ) هەڵسایەوەو گوتی :–

ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کەسەی نەتوانێت جیهاد بکات چی بۆ ئەو هەیە ؟!

قسەکەی تەواو نەکرد دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ لەشی گران بوو ، ڕانی لەسەر ڕانم داناو ، هەروەکو جاری یەکەم گرانی‌یەکی زۆر کەوتە سەرم ، پاشان نیگاکەی لەسەر لاکەوت و فەرمووی :–

ئەو نووسینەی نووسیبووت بیخوێنەوە ، خوێندمەوە

﴿ لا يستوى القاعدون من المؤمنين ﴾

فەرمووی بنوسە ،﴿ غَيرُ أولي الضّرر ﴾ بەم جۆرە کۆمەڵی پاساودراوەکان ئاشکرا بوو لە کاتێك ( کوڕی ام مکتوم ) هیواخواز بوو بۆی

لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە ( عبداللّەی کوڕی ام مەکتوم ) و نموونەی وەکو ئەوی گای پێدا بوون کەوا لە جیهادکردن بەشداری نەکەن ، بەلاّم ( عبداللّەی کوڕی ام کتوم ) دەروونی قەبوڵی نەکرد لەگەڵ دانیشتوان دابنیشێت ، لەبەر ئەوە بڕیاریدا یهاد بکات لە ڕێگای خودا ، لەبەر ئەوەی دەروونی بەڕێزو مەزن بە هیچ شتێك ڕازی ێت تەنها بە کاروباری گەورە نەبێت

ئیتر لەم ڕۆژەوە بڕیاریدا هیچ جەنگێکی تری لە دەست نەچێت و ، کاری بۆ خۆی گۆڕەپانی جەنگ هەڵبژارد ، ئەوەبوو دەیگوت :-

(( لە نێوان ڕیزی موسڵمانان و ڕیزی گاوران دامبنێن و ئالاّیەکم پێ هەڵگرن بۆ وەی بۆتانی هەڵبگرم و بیپارێزم ، من کوێرم و ناتوانم پشت لە دوژمن بکەم ))

لە ساڵی ( چواردەی کۆچی ) ( عومەری کوڕی خەتتاب ) - خوا لێی ڕازی بێت - یاری دا کەوا لەگەڵ فارسەکان جەنگێکی یەکجارەکی بکات و تەخت و تاجیان بەسەردا رگێڕێت و ڕێگا لە پێش سوپای موسڵمانان بکاتەوە ، ئەوەبوو بۆ کارگێڕەکانی خۆی وسی و گوتی :-

(( لا تدعـــوا أحـــداً لَـــهُ ســـلاحٌ أو فَـــرَسٌ أو نَجـــدةٌ أو رأيٌ الا وجَّـــهتُموهُ يّ ، وَالعَجَــلَ والعَجَــلَ )) ..

هەر کەسێك خاوەن چەك یان وڵاخ یان هێز یان بیروڕا بێت ئەوا بۆ لای ئێمەی ەوانە بکەن ، بە پەلەو بە پەلە ...

کۆمەڵی موسڵمانان بە پیر بانگی فاروق هاتن و لە هەموو لایەکی مەدینەو لە هەموو وچەو کۆلاّنێك ، یەکێك لەم موجاهیدە کوێرانە ( عبداللّەی کوڕی ام مەکتوم ) بوو .

فاروق ( سەعدی کوڕی ابی وقاص ) لەسەر ئەم لەشکرە گەورە کرد بە ەرمانگێڕو ، ئامۆژگاری کردو ، ماڵ ئاوایی لێکرد

کاتێك سوپا گەیشتە قادسیە ، ( عبداللّەی کوڕی ام مەکتوم ) بە خۆو بە قەڵغان و ەموو کەرستەیەکی جەنگی بە دیارکەوتو ، خۆی دانا بوو بۆ هەڵگرتنی ئالاّی وسڵمانان و پاراستنی ئەم ئالاّیەو خۆی بکات بە قوربانی

ئەم دوو سوپایە گەیشتن بە یەك لە ( ٣ ) ڕۆژی خوێناوی ترسناك دا ، ئەم دوو ەشکرە جەنگێکی وایان کرد مێژووی جیهاد ئەوەی بە چاوی خۆی نەبینی بوو تا ڕۆژی سێیەم سەرکەوتنی یەکجارەکی بۆ موسڵمانان بە دیارکەوت و ، مەزنترین دەوڵەتیان وخاندو ، کۆنترین عەرشیان لە ڕیشە هەڵکێشا ، ئالاّی یەکتاپەرستی لە خاکی بت پەرستی بەرز کرایەوە

ئەنجامی ئەم شەڕەش سەدەها شەهید خوێنی ئاڵی خۆیان بەخت کرد ، یەکێك لە نێو ئەو شەهیدانەش ( عبداللّەی کوڕی ام مەکتوم ) بوو ، جەستەی پاکی بە خوێنی شەهادەتەوە لەسەر خاکی قادسیە ڕاکشا

ڕەحمەتی خوا لە موجاهید«پاساودراو» خوای گەورە لە یاوەری بەڕێز ( عبداللّەی کوڕی ام مەکتوم ) ڕازی بێت

*　　　*　　　*

## { ٧٧ }

## ﴿ فاطمـــەی زەهـــراء ﴾
## پاکی پاکان و گەورەی ئافرەتانی بەهەشـت

گەورەی ئافرەتانی جیهان لە کاتی خۆی و ، چوارەمین کچی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دایکی ( خەدیجەی کچی خوەیلید ) دایکی بڕواداران

خـوای گـەورە وا حـەزی کـرد ڕۆژی لـە دایـك بوونـی ( فاطمـە ) ببەسـترێتەوە بـە ڕووداوێکی مەزن لە ساڵی ( پێنج ) ی پێش نیگا کەوا قوڕەیشی یەکان تێیدا ڕازی بوون بەوەی موحەممەد ببێت بە دادوەر لە نێوانیاندا لە کاتێك دا کێشە لە نێوانیـان دا زۆر توونـد بووبوو لەسەر دانانی بەردە ڕەشەکە پاش نوێکردنەوەی داڕشتنی کەعبەو ، بینرا چۆن پێغەمبـەری خوا ﷺ توانـی ئـەم کێشـەیە چارەسـەر بکـات بـە هـۆی ئـەم ژیـری و زیرەکی یـەی تێیـدا هـەبوو ، توانـی شمشـێرەکانی جـەنگ لـە نێـو هۆزەکـانی مەککـە بگێڕێتەوە ناو کالانەکانیان .

مزگێنی درا بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە منداڵ بوون ، ئـەویش ڕووی پـاکی گەشـایەوە بە خێرو بەرەکەت و ، ناوی نا ( فاطمە ) و نازنـاوی ( زهـراء )ی پێبەخشـی و ، هـەروەها نازناوی بنەوانی ( أم ابیها ) باوکیشی لێنرا خودای گەورەی لێ ڕازی بێت ، هەروەها لە شێوەو ئاکاردا زۆر لە باوکی دەچوو ﷺ

( فاطمە ) لە ماڵی پێغەمبەری بە بەزەیی پەروەردە بووو ، چاودێری و شـەونخوونی بۆ کرا لەسەر پەروەردە بۆ ئەوەی بەشێکی بەنرخ لە پـەروەردەو نـەرم و نیانی و ڕێنمـایی پێغەمبەرایـەتی ڕوناك وەربگرێت ، کـەوا ئـەم سیفەتە پـاك و بێگەردانـە هـەر هـەمووی لـە دایکـی خۆشەویسـتی ( خەدیجـەی کچـی خوەیلیـد ) – خـوا لـێی ڕازی بێـت – دەهاتە جێ

بـــەم جـــۆرە گـــەورە بـــوو لەســـەر پاکی یـــەکی بێ ســـنوور ، گـــەورەیی دەروون و ، خۆشەویستی چاکەو ، ڕەوشتی بەرز ، کەوا ئەمانەش وەرگیرا بوون لە باوکی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـەوا بـەرزترین نموونـەو چاکـترین پێشـەوا بـوو لـە هـەموو هەڵس وکەوتەکانیدا ...

هێشتا پاکی پاکان ( زهراء ) تەمەنی نەگەیشتبووە ( ٥ ) ساڵان ، تا گۆڕانکاری یەکی زۆر گرنگ ڕوویدا لە ژیانی باوکی بە هاتنە خوارەوەی نیگا ، لە یەکەمین سات و کاتدا هەستی کرد بە گرانیەکانی بانگهێشتن و ، بینـی وا دایکی دەوەستێت لە تـەك باوکی و بەشداری هەر کارەسات و ڕووداوێك دەکات کەوا دێتە ڕێی مێردەکەی

( فاطمە ) زۆر لـە فرت وفێڵەکانی گاورانی بینـی کـەوا دەکرایـە سـەر بـاوکی مـەزنی هیواخواز بوو ئەگەر بیتوانی بوایە گیانی خۆی پێشکەش کردبا بۆ ئـەوەی لـە ئـازارو ئەشکەنجەی گاوران بیپارێزێت ، بەڵام لـە توانـای نـەبوو لەبەر ئـەوەی تەمـەنی پـیرۆزی بچووك بوو ...

یەکێك لە توونـدترین ئەم ئازارو ئەشکەنجانەی تووشی بوو لە سەرەتای نیگا بووَ ئەمەش بە هۆی ئەم گەمارۆیە توونده بوو کەوا موسڵمانان پـێی ئازاریـان خـوارد لەگەڵ

ئەوەی هاشم لە دۆلی ( ابو طالب ) تا وای لێهات ئەم گەمارۆیە برسی کردنە کاری کردە سەر تەندروستی و وای لێهات بە درێژایی ژیانی بە بێهێزی و لاوازی گەشەنەکردن بمێنێتەوە

( زهراء )ی کیژۆلەی بچووک پاش ڕزگاربوونیان لە گەمارۆی بە هیلاک بەر ئەوەندەی نەبرد لەناکاو کۆچی دوایی دایکی ( خەدیجەی کچی خوەیلید ) ی بینی - خوا لێی ڕازی بێت - ، دڵ و دەروونی پڕ بوو لە خەم و خەفەت و ئازار

( فاطمە ) لەپاش مردنی دایکی خۆی لە نێو بەرپرسێتی زۆر و گەورە بینییەوە بەرامبەر بە باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوەبوو بە گیروگرفتی زۆر گران تێپەڕی لە ڕێگای بانگێشتن بۆ خودا ، بە تایبەتی پاش مردنی مامی ( ابو طالب )و - خوا ئازاری دۆزەخی لەسەر کەم بکاتەوە - لەگەڵ مردنی دایکی بەوەفای ( خەدیجە ) - خوا لێی ڕازی بێت -

( فاطمە ) ئەوە بوو بەرگەی ماندووبوونێکی زۆر و ئارام گرتنێکی بێوێنەی گرت بەرامبەر وەرگرتنەوەی پاداشت لە خوای گەورە ، لە تەك باوکی خۆشەویستی وەستا بۆ ئەوەی قەرەبووی خزمەتکردنەکانی دایکی بەوەفای بکاتەوە کەوا مەزنترین دایك و بەڕێزترین دایك بوو لەبەر ئەوە بە بنەوانی باوکی ناسرا بوو

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای‌دا بە یاوەرەکانی بۆ کۆچ کردن بۆ مەدینە یەکێك هەڵسا بە مەزنترین دەور ئەمەش ( عەلی کوڕی ئەبو طالب ) بوو - خوا لێی ڕازی بێت - هەڵسا بە پێشکەش کردنی گیانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر جێگای ئەم نووست بۆ ئەوەی پیلانەکانی قوڕەیش تێك‌وپێك بدات ، پاشان سێ ڕۆژ لە مەککە مایەوە بۆ ئەوەی ڕاسپاردەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەڕێنێتەوە دەست خاوەنەکانیان

( فاطمە ) و خوشکەکەی ( ام کلثوم ) لە مەککە مانەوە تا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ یاوەرێکی نارد بۆیان بۆ ئەوەی ئامادەیان بکات ئەمەش لە سالی (سێزدەهەمی ) پێغەمبەرایەتی بوو

( فاطمە ) تەمەنی پیرۆزی گەیشتبووە ( هەژدە ) سالان ، لێرەدا موسلمانە کۆچ کردووەکان واتە لە شاری مەدینە خۆیان لە شوێنێکی جێگیر و سەلامەت بینییەوە دوور لە ئازار و ئەشکەنجە ، هەروەها دەردی غەریبی و دوورە وڵاتیشیان لەیاد چوویەوە بە هۆی ئەم برایەتی‌یەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستی کرد لە نێوان یاریدەدەر و کۆچ کردووەکان ، پێغەمبەری خوا ﷺ ( ئیمامی عەلی ) هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێت بە برای

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ( عائیشەی کچی ئەبوبەکر )ی - خوا لێی ڕازی بێت - گوێزایەوە زۆر لە یاوەرە بەرزەکان هاتن بۆ داخوازی ( زهراء ) پاش ئەوەی ماوەیەك بوو نەدەچوونە پێش لەبەر ئەوەی ( فاطمە ) بووبوو بە بنەوانی باوکی و خزمەتی دەکرد

( ئیمامی ئەبوبەکر )و ( ئیمامی عومەر ) - خوایان لێی ڕازی بێت - هاتن بۆ داخوازی ( زهراء ) بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ بە نەرمیەکی بێوێنە داوای لێبووردنی لێ‌کردن

پاشان ( عەلی کوڕی ئەبو طالب خوا لێی ڕازی بێت - هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ داواکردنی دەستی کچەکەی ( فاطمە ) هەروەك ( ئیمامی عەلی ) دەڵێت دەمویست داوای دەستی ( فاطمە )ی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم ، دەمگوت

سوێند بە خوا هیچ شتێکم نی یە . پاش پەیوەندی خزمایەتیم بەیاد خۆ دەهێنایەوە ، گەڕامەوە لای و داوای دەستی کچەکەم لێ ی کرد

پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ی فەرمووم :-

ئایا هیچ شتێکت هەیە ؟

گوتم :- نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا

پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرمووم :-

کوانێ ئەم زرێیە بازنەدارەی فلانە ڕۆژ پێم دایت ؟

گوتم :- ئەمە لە لامە ئەی پێغەمبەری خوا

پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرمووم :- بیدە بەمە ؟

( ئیمامی عەلی ، زۆر بە خێرایی دەرچوو و زرێیەکەی هێنا ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد بیفرۆشێتەوە بۆ ئەوەی بە نرخەکەی جیهازی بوکێنی پێ بکرێت ، ( ئیمامی عثمان ) - خوا لێ ی ڕازی بێت - بە نرخی چوارصەدو حەفتا درهەم لێ ی کریەوەو ، ( ئیمامی عەلی ) پارەکەی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش ﷺ پارەکەی دا بە ( بیلال ) بۆ ئەوەی بە پارەکەی هەندێك بۆن و پێویستی پێ بکرێت . پاشان ئەو پارەیەی مایەوە درا بە ( أم سلمه ) - خوا لێ ی ڕازی بێت - بۆ کڕینی جیهازی بوکێنی ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ یاوەرەکانی بانگ کرد کردنی بە شاهید لەسەر ئەوەی کە کچەکەی ( فاطمه )ی دا بە ( عەلی کوڕی أبو طالب ) لەسەر چوارصەد ( مثقال ) لە زیو لەسەر سوننەتی فەرزی بە ئەرك زانراو ، ئەم داخوازی یە پیرۆزە کۆتایی هات بە موبارەکی ئەم بووك و زاوایەو . دوعایان بۆ کرا بە ئەوەی چاك و ، پاشان قاپێکی خورما هێنرا بۆ میوانەکان لە یاوەرە بەڕێزەکان

لە شەوی گواستنەوەی ( زهراء ) بۆ سوارچاکی ئیسلام ( عەلی کوڕی أبو طالب ) - خوا لێ ی ڕازی بێت - کەوا ئەم شوێنەیان بۆ ئامادەکرابوو تێیدا چاوەڕێ ی بکەن

پاش نوێژی ( عیشا ) پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لایان و پاشان داوای ئاوی کرد و دەستنوێژی پێ شوشت پاشان ئاوەکەی بەسەر ڕژاندن و فەرمووی :-

(( پەروەردگارا پیرۆزیان کەیت ، پیت و فەڕیان بەسەردا بڕێژی و . نەوەکانیشیان پیرۆز بکەیت ))

موسڵمانان زۆر کەیف خۆش بوون بەوەی ( زهراء ) بوو بە خێزانی ( ئیمامی عەلی - خوا لێ ی ڕازی بیت -( حمزه )ی مامی پێغەمبەر ﷺ و مامی ( عەلی ) هات - خوا لێیان ڕازی بێت - دوو مەڕی هێنا وسەری بڕین و بەسەر خەڵکی مەدینەدا دابەشی کرد

ساڵێك بەسەر ئەم ژن هێنانە پیرۆزە تێنەپەڕی تا خوای گەورە چاوی زهراء )ی ڕوون کردەوە لەگەڵ ئەوانەی ( زهراء )یان خۆش دەویست بە منداڵێك ئەوەی یەکەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ( حەسەنی کوڕی عەلی لە سالی سێ ی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر کەیف خۆش بوو ، بانگی لە گوێ ی داو پاشان لیکی پیرۆزی خۆی خستە ناو دەمی و سەری تاشی بەکێشی تاشینەکە واتە مووی سەری زیوی کڕی و کردی بە خێر بەسەر هەژاران دا

( حەسەن ، تەمەنی پیرۆزی ساڵێك تەواوی نەکردبوو تا ( حسین )ی بە دوا داهات لە مانگی شەعبانی سالی چواری کۆچی

پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ڕوناك بووەوە بەم دوو كوڕە پیرۆزە لە دایكو باوكێكی پیرۆز ( حەسەنو حوسەین ) بە جۆرێك خۆشەویستی‌یەكی بێ‌سنووری هەبوو بۆیان كاتێك ئایەتی :

﴿ انّما يُرِيدُ اللّه لِيذهِبَ عَنكُم الرّجس أهل البيت وَ يُطَهِرُكُم تَطهِيرا ﴾

لە سوڕەتی ( احزاب ) هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای ( أم سلمه ) بوو - خوا لێی ڕازی بێت - داوای ( ئیمامی عەلی و فاطمه و حەسەنو حوسەینی ) كرد بە قوماشێك دایپۆشین پاشان فەرمووی :-

(( پەروەردگارا ئەمانە بنەماڵەی منن ، پەروەردگارا خراپەیان لەسەر لاببەو بە باشترین شێوە پاكیان بكەرەوە )) پاشان سێ جاران فەرمووی :-

(( اللهم اجعل صلواتك على آل محمد كما جعلتها على آل ابراهيم انك حميد مجيد )) .

پاشان ( زهراء ) منداڵی تری بوو ، لە ساڵی پێنجی كۆچی كچێكی بوو باپیرەی ﷺ ناوی ( زەینەب )ی لێنا ، پاش دوو ساڵی تر كچێكی تری بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ( ام كلثوم )

بەم جۆرە بەخششی خودا ڕژا بەسەر ( زهراء )و ، چەند منداڵێك كەوا باپیرەیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتنە سەر دونیا ، دونیایان پێ ڕوناك بۆوە.

خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ( فاطمه ) گەیشتبووە ڕاددەیەك ئەگەر لە سەفەرێك گەڕابایەوە پاش ئەوەی دوو ڕكات نوێژی لە مزگەوت دەكرد ، پاشان دەچووە لای ( فاطمه ) ، ئینجا دەچووە لای خێزانەكانی

( عائیشه ) دایكی بڕواداران - خوا لێی ڕازی بێت - دەڵێت :-

(( هیچ كەسێكم نەبینی لە قسەو گفتوگۆدا وەكو ( فاطمه ) بە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت ، كاتێك دەهاتە لای بۆی هەڵدەستایەوەو ماچی دەكرد و بەخێرهاتنی دەكرد ، بەم جۆرە ڕەفتاری لەگەڵ دەكرد ))

خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ بو ( فاطمه ) سنووری بەزاند كاتێك لەسەر مینبەر بوو دەیفەرموو (( فاطمه بەشێكە لەمن هەر كەسێك تووڕەی بكات ئەوا منی تووڕە كردووە ))

لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت :-

(( فاطمه بەشێكە لەمن ، ئەو كەسەی دڵ تەنگی بكات ئەوا منی دڵ تەنگ كردووەو ، هەر كەسێكیش ئازاری بدات ئەوا منی ئازار داوە ))

لەگەڵ ئەم هەموو خۆشەویستی‌یەش ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشكرا بە ( فاطمه ) و خەڵكی تر ڕادەگەیەنێت كەوا تەنها كردەوەی چاك بەكەڵكیان دێت لە ڕۆژی دواییدا ، ڕۆژێك هەڵسایەوەو بانگی كرد :-

(( ئەی كۆمەڵی قوڕەیش دەروونی خۆتان بكڕنەوە من لەلای خودا دادتان نادەم ئەی فلان ئەی فلان ئەی ( فاطمەی كچی موحەممەد ) داوام لێبكە لە ماڵم ، من لەلای خودا بە كەڵكت نایەم ))

لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت :- (( ئەی ( فاطمەی كچی موحەممەد ) خۆت ڕزگار بكە لە ئاگر من لە لای خودا بە كەڵكت نایەم نە بە زیان نە بە قازانج ))

( ثوبان ) - خوا لێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوەو دەڵێت :- منو پێغەمبەری خوا ﷺ چووینە لای (فاطمە ) خەناوکەیەکی زێڕی لە ملی خۆی کردبوو ، گوتی :-

ئەمە باوکی ( حەسەن ) پێشکەشی کردووم ، ئەویش فەرمووی :- ئەی ( فاطمە ) حەز دەکەیت بڵێن :-

ئەوە ( فاطمەی کچی موحەممەدە )و زنجیرێکی ئاگری لە دەستە ؟ )) پاش زۆر گازاندەی لێ کردو ، ئەویش دانەنیشت بۆی دەرچوو ، بڕیاریدا ، خەناوکەکەی فرۆشتو بە نرخەکەی ئافرەتێکی کۆیلەی کڕیو ئازادی کرد ، ئەمە گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی :

(( سوپاس بۆ ئەم خودایەی ( فاطمە )ی ڕزگار کرد لە ئاگر ))

ئەم پلەیە بوو کەوا ( فاطمە ) گەیشتێ لەلای باوکی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سنوورەکانی خودا نەرمی بۆ نەدەنواندو بەڵکو بە جۆرێك هەڕەشەی لێدەکرد کەوا لە ڕۆژی دواییدا ئەم دادی نادات و خۆی لێپرسراوی خۆی دەبێت لە کردەوەکانی ، بەڵکو لە دونیاش ئەگەر سنوورێکی خوا ببەزێنێت ئەوا تۆڵەی لێدەکاتەوە ، ئەگەر هاتوو دزییەك بکات ئەوا دەستی دەبڕێت

لەگەڵ ئەم هەموو خۆشەویستییەش پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ( فاطمە ) هەموو کات ناخۆشی ژیانو هەژاری بەسەر دەوڵەمەندی بۆ هەڵدەبژاردن

هەروەك ( ئیمامی عەلی ) - خوا لێی ڕازی بێت - بە ( فاطمە ) دەڵێت :-

ئەی ( فاطمە ) ماندووت کردووم تا نارەحەتت کردم ، خودا دیلی شەڕی بۆ هێناوین بڕۆ یەکێك بهێنە با خزمەتت بکات

ئەویش گوتی :- ( انشاء اللّه ) ئەمە دەکەم پاشان چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك بینی پێشوازی لێکردو پرسیاری لێکرد :-

چی تۆی هێنا ئەی کچم ؟

ئەویش گوتی : هاتووم سەلامت لێبکەم ، پاشان شەرمی کرد داوای لێ بکات و ، گەڕایەوە ئیتر هەموویان هاتن بۆ لای ، ( ئیمامی عەلی ) ئەمەی پێگوت

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

نەخێر ، سوێند بەخوا ، پێتان نابەخشم نابینن میوانانی ئیسلام قوڕەی سکیان دێت ، هیچ شتێك نیە پێیان ببەخشرێت ، بەڵکو دەیانفرۆشمەوەو نرخەکەیان پێدەبەخشم ))

گەڕانەوە بۆ ماڵەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لایانو بینی لەژێر پێخەفەکانیان ، کاتێك سەریان داپۆشی پێیان بەدیار کەوت ، کاتێك پێیان داپۆشی سەریان بەدیار کەوت ، پێغەمبەر ﷺ ئەم دیمەنەی بە چاوی خۆی بینی

فەرمووی :- لە شوێنی خۆتان بن ئایا هەواڵی خێرێکتان بدەمێ ، چاکتر لەمەی داواتان کردبوو ؟

گوتیان :- بەڵێ

فەرمووی :- (( چەند وشەیەك جبرائیل فێریانی کردم ، لەپاش هەموو نوێژێك دەجاران ( سبحان اللّه و الحمدللّه و اللّه اکبر ) دەکەن ، کاتێك چوونە سەر جێگەکانتان

( سبحان الله  و ( الحمدلله ) و سی‌وسێ جار ( الله أكبر ) دەکەن ، ئەمە لە خزمەتکار بۆ ئێوە باشترە )) .

( ئیمامی عەلی ) - خوا لـێی ڕازی بێـت - دەڵێـت وازم لەمانـە نـەهێنا لـەم ڕۆژەی فێریان بووم ، پیاوێك لە هاوڕێکانی پرسیاری لێکرد :- هەتا شەوی ( صفین ) ؟

گوتی :- هەتا شەوی ( صفین )یش ...

( فاطمە )ی بەڕێز - خوا لـێی ڕازی بێت - زۆر ڕووداوی ئاڵۆزو ناخۆشی تـووش بـوو ، ئەمـەش لـە سـەرەتای گەنجێیـەتی بـوو کـاتێك مردنـی دایکـی بینـی ، پاشـان ( روقیە )ی خوشکی ، لەساڵی هەشتی کۆچی ( زەینەب )ی خوشکی ، پاشان لە ساڵی نۆی کۆچی ( أم کلثوم )یش کۆچی دوایی کرد ...

لەگەڵ ئەمـەش ژیانی نـەبوونی کـارێکی گـەورەی لـێکرد ، بـەڵام وە نـەبێت کچێك پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەی کردبێت هەر لەناو ناخۆشـیو نـائومێدی ببێـت ، بـەڵکو ئـەم ئافرەتـە بـوو بـە نموونـەی ئـافرەتی ئـارامگرتوو موجـاهیدو کـۆچ کـردوو لـە ڕێگای خوا ...

کـاتێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ حـەجی مـاڵ ئـاوایی کـرد و ، پایـەکانی ئیسـلامی چەسـپاندو ، خـودا ئایینەکـەی خـۆی تـەواو کـرد ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـەخۆش کەوت ، هـەر کە ( فاطمـە ) ئەم هەواڵـەی بیسـت بە پەلـەو بێدواکەوتن گەیشـتە لای بـۆ ئەوەی لە ساغ‌وسەلامەتی دڵنیا بێت ، لـە کاتێك لە لای ( عائیشـە ) بوو - خـوا لـێی ڕازی بێت - کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی هەڵسا بۆ پێشوازیکردنی و فەرمووی :-

بەخێر بێت ئەی کچم ، پاشان ماچیکردو لە تەنیشت خۆی داینا

پاشان نهێنی‌یەکی لەلای درکاند ئەویش بە توندی گریاو ، کاتێك بینـی بـەم جۆرە نهێنی دووەمی لـەلا درکاند ، پێکـەنی ، ( عائیشـە ) پـێی گـوت پێغەمبـەری خـوا تـۆی تایبـەت کردووە بە نهێنی لـەنێو هـەموو ئافرەتـەکانی ، پاشـان تـۆ دەگرییێـت ؟ کـاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا ( عائیشە ) پێی گوت :-

پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ گوتیت ؟

ئەویش گوتی :- ناتوانم نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا بکەم ...

( عائیشە ) دەڵێت :-

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد بە ( فاطمە )و گوت :-

سوێندم بەم مافەی من لەسەر تۆمە کاتێك قسـەت لەگـەڵ کـردم پێغەمبـەری خوا ﷺ چی پێت فەرموو :-

( فاطمە ) گوتی :- بەڵام ئێستا بەڵێ

کاتێك جاری یەکەم نهێنی پێ گوتم ، هـەواڵی دا من کەوا جوبرائیل هـەموو سـاڵێك جارێك دەهاتە لامو پیاچوونەوەی لەگەڵ دەکردم ، بەڵام ئێستاکە دووجار پیاچوونـەوەم لەگەڵ دەکات من وا دەبینـم مردنم نزیك بۆتـەوە ، لـە خوا بترسـەو ئـارامت هـەبێت ، من باشترین کەس بووم بۆ تۆ ، ( فاطمە ) دەڵێت :-

ئـەم گریانـە گریـام کـە تـۆ بینیـت ، کـاتێك گریـانی بینیـم نـهێنی دووەمـی پێگوتم ، فەرمووی :-

ئەی ( فاطمە ) ، ڕازی نابیت ببیت بە گەورەی ئافرەتانی خەڵکی بەهەشت ؟! تۆ یەکەم کەس دەبیت لە کەسوکارم بە من دەگەیت ؟

منیش پێکەنیم .

ئازاوی نەخۆشی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ توندتر دەبوو ، خەم لەسەر دڵی( فاطمە )ش زۆرتر دەبوو شەونخوونی باوکی دەکردو خزمەتی دەکردو ئارامی دەگرت ...

بەڵام کاتێك بینی ئازار لەسەری زیاتر دەبوو لە کۆتایی ژیانێتی بە دەنگێکی پڕ لە گریان و خەمەوە دەیگوت :-

ئای لەم ناخۆشیەی سەر باوکم ؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو :-

لەپاش ئەم ڕۆژە ناخۆشی لەسەر باوکت نیە ... کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی پاکی بۆ لای پەروەردگار بەرز بۆوە ( فاطمە ) دەیگوت :-

ئەی باوکە پەروەردگار وەڵامی نزاکەی دایەوە ... ئەی باوکە بەهەشتی فیردەوس شوێنت بوو ..

ئەی باوکە سەرخۆشی لە جوبرائیل بکەین ..

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەخاك سپێردرا ( فاطمە ) دەیگوت :-

ئەی خەڵکینە چۆن دڵتان دێت خۆڵ بەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دابکەن

( زەهراء ) دەگریا ، موسڵمانان هەر هەموویان لەگەڵی گریان بۆ پێغەمبەرەکەیان موحەممەد ﷺ ئەم ئایەتی خوایان بەیاد هاتەوە :

﴿ وما محمد الاّ رسولٌ قَدْ خَلَت مِن قَبلهِ الرُّسُل ﴾

لەگەڵ ئایەتی خوا

﴿ وَمَا جَعَلنا لِبَشَرٍ من قَبلِكَ الخُلد أفإين مِتَّ فَهُم الخالِدُون ﴾

شەش مانگ بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ تێنەپەڕی تا ( زەهراء )یش نەخۆشی بەرۆکی گرت ، مزگێنی پێدرابوو بو مزگێنی باوکی ﷺ کەوا یەکەم کەسە لە کەس وکاری پێی دەگات .

لە شەوی سێشەممەی مانگی سێی ڕەمەزانی ساڵی یازدەی کۆچی لە تەمەنی بیست و حەوت ساڵی دا گەیشت بە پەروەردگاری بۆ ناو بەهەشتی فیردەوس .

ڕەحمەتی خوا لە ( زەهراء )ی گوڵی گەورەی ئادەمیزادو ، خێزانی گەورەی سوارچاکان و ، دایکی ( حەسەن )و گەورەی گەنجە شەهیدەکان ( حوسەین )و دایکی ( زەینەب ) قارەمانی کەربەلا

( زەهراء ) جوانترین نموونەی ئافرەتانی موسڵمانانی پێداین و نموونەی ئافرەتان بوو لە پەیوەندی دراوسێیەتی و خزمایەتی و ، پیشەنگی پەیامی دایکایەتی و ڕێنمایی بوو بۆ کوڕەکانی لەسە رجیهادو خۆ بە قوربانیدان لە ڕێگای خوادا

هەر ئەوەندەشمان لەدەست دێت بە یەکەوە بڵێین :-

سەلامی خوا لە ( زەهراء )ی پاکی پاکان و خۆشەویستی پێغەمبەرو خۆشەویستی هەموو موسڵمانان .

* * *

# ٧٨

## ﴿ ئەسلەم ، عەمرو کوڕی ثابت ﴾

# دوو شەهید پاش ئەوەی یەك کڕنۆشیان لە نوێژ بۆ خوا نەبرد

## { ٧٨ }

# ﴿ ئەسلەم ، عەمرو کوڕی ثابت ﴾

### (( دووشەهید پاش ئەوەی یەك کڕنۆشیان لە نوێژ بۆ خوا نەبرد ))

ئەوەی گومانی تیا نی‌یە ئەوەیە شەهادەت ترۆپکی جیهادە ، شەهادەتیش جوانی خواپەرستی‌یە ، لەبەر ئەوەی خۆ بەقوربانی‌دانە بە گیان‌و ، سەخاوەتیش بە نەفس واتە گیان بەرزترین پلەی سەخاوەتە ، هەروەك پێشینان دەڵێن گەیشتن بەم پلەیە پێویستی بە پەروەردەیی ئایینی‌و دەرگای فرەوانی ڕەوشت هەیە ، تا مرۆڤ دڵنیا بێت‌و ، بەبێ دوو دڵی گیانی خۆی بە قوربان بدات

شوێن کەوتووانی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لە سەرەتای ئیسلام دا لە قوتابخانەکەی دەردەچوون‌و ، خۆیان ڕادەهێنا لەسەر ڕێبازو پیلانەکانی ، هەروەها ڕاستڕێ بوون لەسەر ڕێگاکەی لە کردەوەو کردارو خواپەرستیەکانیان ، پاشان دڵسۆز دەبوون بە هەموو توانایەك‌و گیان فیداکردنێك لە پێناوی خواو بانگەکەی

بەڵام خەڵك لە زەمانی بێ‌هێزی‌و لادان دا پابەند نەبوون بە ڕاستە ڕێگا ، بەڵکو ڕاست‌و ناڕاستی‌یان تێکەڵ بەیەك دەکرد ، ئەرکێکی خوایان جێ‌بەجێ دەکردو کەمتەرخەمیان لە چەندەها ئەرك دەکرد ، لەبەر ئەوە ئەو جۆرە کەسانە دەبینین دەترسن لە ڕۆژی لێپرسینەوە لە خاڵێکی ڕەش دا کەوا نووساوە بە لاپەڕەکانیان ، ئەگەر کاتی جیهاد هات‌و ، بەرەنگاری شەهادەت بۆوە ، زۆر کەس لە چارەنووسی ئەو کەسە دەپێچنەوە کەوا چەند گوناهێکی کردووە لە ژیانی‌و ، کەم‌و کورتی کردووە لە فەرمانەکانی خودا ، پاشان دەرچووە بۆ مەیدانی جەنگ و ، شەڕی کردووە تا لە گۆڕەپانی تێکۆشان مردووە ، ئایا دەبێ ئەم کەسە شەهید بێت لەگەڵ ئەوەی پێشتر گوناهی کردووەو هەروەها لە مەیدانی خواپەرستی‌و کردەوەی چاك ڕەصیدی کەمە ؟ ئایا دەبێت خوا لەم گوناهبارە خۆش بێت ؟

وەڵام بۆ ئەو پرسیارە دووبارەیە ، دیارە لە لای هەر کەسێك وانەکانی ئیسلامی خوێند بێت‌و ، دڵی ڕوناك ببێتەوە بە هیدایەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ، ئەمەش ئەگەر موسڵمانێکی گوناهبار ئەگەر بەرەنگاری جەنگ بێتەوەو ، هەوڵی بەشداری‌کردنی‌دا ، بە ڕاستی وازی هێنا لە گوناهەکانی ، بەڕاستی بەپیر فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی هات ، بە دڵسۆزی گەڕایەوە لە گوناهەکانی‌و ، بڕیاری‌دا کەوا جارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر ئەم گێلی‌و نەزانی‌یە و ، چەکی هەڵگرت‌و ، ڕۆیشت بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی فەرمانەکانی جەنگ ، پاشان تووشی مردن هات ، ئەگەر پاش ماوەیەکی

کورتیش بێت  لیرەدا ئەم جۆرە کەسە دەبێت بە شەهیدێکی بەڕێز لە لایەن خوای گەورە . ( انشاء الله  خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت

هەروەکو بڵێیت خوێنی ئەم شەهیدەی کەوا لە جەستەی جۆگەی کردووە پاکەو ئینجا چ پاکێك گوناهەکانی دەشواتەوەو  جل‌وبەرگی جوان دەکاتو  لەوانەیە ئەمەش چەند بەشێکی ئەم نهێنی‌یە بێت کەوا شەهید ناشۆرێتو بەڵکو کفن دەکرێت بە جل‌وبەرگەکانی خۆی  بەخاك دەسپێردرێتو . ئینجا خوای گەورە ئەم کەسە قەبووڵ دەکات لە نێو خۆشەویستەکانی و لە جیهانی بەرزەوە بانگ دەکرێتو پێی دەڵێت :-

﴿ يا أيها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية ، فأدخلي في عبادي وادخلي جنتي ﴾

پیاوێك هاتە لای گەورەمان پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت :-

ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەگەر بینیت کوژراوم لە ڕێگای خوا ، ئایا خوا لە گوناهەکانم خۆش دەبێت ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دایەوەو فەرمووی :-

بەڵێ ، لەکاتێك تۆ خۆڕاگر بیتو وابزانی پاداشتت لەلای خوا دەدرێتەوە  بەرامبەر بیت پشت نەکەیت ، تەنها قەرز نەبێت ، جوبرائیل سەلامی خوای لێ‌بێت ئەمەی پێ‌گوتم :-

هەروەکو بڵێیت باسکردنی قەرز لێرەدا – ئاگادارکردنەوەی موسڵمانە لەبەرگەگرتنی هەنگرتنی قەرز . ئەگەر هاتوو شەهید قەرزی لەسەر بووو ، هەندێك ماڵی لە دوای خۆی جێ‌هێشت  پێویستە کەس‌وکارەکەی بۆ یەکەم جار لەم ماڵە قەرزەکەی بۆ بدەنەوە

لەبەرئەوە گەورەی جنۆکەو ئادەمیزاد ﷺ فەرموویەتی :-

(( الشهيد يغفر له في أول دفعة ))

واتە :- لەگەڵ یەکەم فرکەی خوێن . خوای گەورە لە گوناهەکانی شەهید خۆش دەبێت . بە مەرجێك ئەم شەهید بوونە لە ڕێگەی  خوا بێتو مەبەستیش بەرزکردنەوەی ووشەی ( لا اله الا الله محمد رسول الله ) بێت

لە سیرەی گەورەمان موحەممەد ﷺ هەندێك هەڵوێست هەیە کەوا فێرمان دەکات رووکردنە خوای گەورە بە دڵسۆزی گوناهەکانی پێشوو ڕەش دەکاتەوەو . هەروەها ئەنجامی کۆتایی کرنەوەی مەزن ناوەستێت لەسەر لێخۆشبوونی خوا لەسەر درێژی تەمەن و کردەوەی زۆر

ئەم پیاوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ گاور بوو ، ناوی ( ئەسلەمە ) بوو هەندێك دەڵێن ناوی  یسار ) بوو – نازناوی ( شوانی ڕەش ) بووو  بەندەیەکی

حەبەشی بوو ، ئەم شوانە ڕەشە بە کرێگرتە بوو لە لای جولەکەیەك ، مەڕی بۆ دەلەوەڕاند ، پاشان خوای گەورە دڵی بۆ ئیمان هێنان کردەوەو ، چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەو کاتەی گەمارۆی خەیبەر و ئەو جولەکە بێسیفەتانەی دابوو کەوا خراپەیان دەکرد لەسەر زەوی ، ئەم شوانە ڕەشە بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت :-

ئیسلامم پێشنیار بکە ...

پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی هیچ کەسێکی بە سووكو بچووك نەدەزانی بۆ بانگهێشتن بۆ سەر ئاینی ئیسلام ئینجا ئەم پیاوە بەندە بوایە یاخۆد پیاوێکی گەورە ، ئیتر سینگی ئەم شوانە ڕەشە جۆش درا بۆ ئیسلام ، زمانی بەقسە کەوت کەوا ڕەنگ دانەوەی دڵی بوو ، گوتی :-

( أشهد أن لا الـه الا الله وأشهد أن محمداً رسول الله ) ...

پاشان شوانەکە ئاماژەی بۆ مەڕەکانی کرد کەوا لەگەڵی بوون و گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، من کرێگرتەم لەلایەن خاوەنی ئەم مەڕانە ، چییان لێبکەم ، دوو مەڕو سێ مەڕ ماڵی خەڵکن ، ئەمانە لای من ڕاسپاردەن ...

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

لە سەربازگەی ئێمە بیبە دەرەوە ، گۆپاڵەکەی خۆتی بۆ بهاوێژە ، ئەمانە دەگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنەکانیان و خودا ڕاسپاردەکەت دەگەیەنێتە شوێنی خۆی .

( ئەسلەم ) گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوای کردو بە گۆپاڵەکەی دەستی دەنگیدا مەڕەکانی بۆ لای ماڵی خاوەنەکانیان و ، دەیگوت :-

بگەڕێنەوە بۆ لای خاوەنەکانتان ، سوێند بەخوا جارێکی تر خاوەنتیتان ناکەم ، مەڕەکان هەروەکو بڵێیت یەکێك بە پێشەخوی دابن ملی ڕێگایان گرت ، تا گەیشتنەوە بەردەرگای خاوەنەکانیان .

ئیتر پاش کەمێك ( ئەسلەم ) چەکەکەی هەڵگرت و ، لەگەڵ هاوڕێکانی جیهادی ڕێگای خوای کرد لەم جەنگەی تازە بۆیان دروست بووبوو ، پاشان تیرێکی پێکەوت کەس نەیزانی لە کام لا بۆی هات ، پێی مرد ، پلەی شەهادەتی وەرگرت لە ڕێگای خودای گەورە پێش ئەوەی نوێژێك بۆ خودا بکات ، لەبەر ئەوە ( جابر کوڕی عبداللّه ) دەڵێت :-

(( بەشەهیدی کوژراو یەك سوجدەی بۆ خوا نەبرد !! )) .

یاوەرەکان لاشەی برا شەهیدەکەیان لەسەر کۆڵی خۆ داناو لە ناوەندی گۆڕەپانی جەنگ بۆ ئەم جێگایەی پێغەمبەری خوای ﷺ لێ بوو ، کاتێك بینی فەرمووی :-

(( خودای گەورە ڕێزی لێناو ، بۆ چاکە بەڕێیکردو ، ئیسلام لەناو دەروونی بەڕاستی بوو ! ))

پاشان پێغەمبەری مەزن ﷺ بە ڕووی پیرۆزی ڕووی کردە لاشەی ئەم شەهیدە و فەرمووی :-

(( خودا ڕووت جوان بکاتو ، بۆنت خۆش بکات )) ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ کەمێك ڕووی خۆی لێ وەرگێڕا پێیان گوت :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ڕووت لێ وەرگێڕا ؟

ئەویش هەروەکو مزگێنی دەرێك فەرمووی :-

ئێستا دوو پەری لەلان خۆڵی پاك دەکەنەوە لەسەر ڕووی و ، پێی دەڵێن :-

خوا ڕووی ئەو کەسە بە خۆڵ کات کەوا ڕووی تۆی بە خۆڵ کردو ، خوا ئەو کەسە بکوژێت کەوا تۆی کوشت ...

بەم جۆرە ئەم شوانە ڕەشە بەڕێکەوت بۆ لای پەروەردگاری بە شەهیدیو لە گوناهەکانی خۆش بوو ، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر کەم لە دونیا بە موسڵمانیەتی مایەوە .

ژیانی ئەم پیاوە لە سیرەی ئەم پیاوە نزیکە ، ئەوەش پیاوێك لە هۆزی ( بنی النبیت ) لە ئەنصارەکان دێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان دەبێو ، دەڵێت :

( أشهد أن لا الـه الا الله وأنـك عبـده ورسـولـه ) ، پاشان پێش دەکەوێت لەگەڵ برا بڕوادارەکانی بۆ جیهاد تا شەهید دەکرێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی دەفەرموێت :-

(( کاری ئەمە ئاسانەو ، پاداشتی زۆرە )) .

ئینجا لێرەدا دەبێت ئەمە بزانین مرۆڤ بۆی نەنوسراوە بە درێژایی ژیانی هەر لە هەڵەو لادان بێتو ، ساڵو ڕۆژی بەسەردا تێپەڕ بێت ، پاشان قەدەرەکان بۆی دەرەخسێننو هیدایەتی خوای پێ نیشان دەدەن هەروەکو هیدایەتی ( شوانی ڕەش ) ، جا پێویستە مرۆڤ خێرا بێتو لە خەوی غەفڵەت بە ئاگا بێتو ، بگەڕێتەوە لای پەروەردگار و ، ئەم دەرفەتە هەڵقۆزێتەوە پێش ئەوەی لە دەستی دەربچێت و تووشی تاڵی ببێت ، پێویستە بۆ تەوبەکردن بە پەلە بێتو ڕاستە ڕێگا بگرێت

﴿ وما تـدري نـفـس مـاذا تكسـب غـداً ، وماتـدري نفس بـأي أرض تـمـوت ، انّ الله عـلـيـم خـبـيـر ﴾

ئینجا ئەگەر خوای گەورە دەرگای فراوانی بەزەیی خۆی کردبێتەوەو ماوەی گەڕانەوەی دابێت جێگای خۆیەتی مرۆڤ قۆڵی خۆی لێ هەڵبکاتو ئەم ئیسلامە پیرۆزو ئەم بەهەشتە خۆشە لە دەست خۆی نەدات .

*　　　　*　　　　*

مێژووی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دیمەنێکی ترمان بۆ دەست نیشان دەکات کەوا زۆر لە دیمەنی ( شوانی ڕەش ) دەچێت ، ئەم نموونەش ( عەمرو کوڕی ثابت کوڕی وقش )ە لە هۆزی ( بنی عبدالاشهل ) نازناوی ( الاصیرم ) بوو ، لەیەك ڕۆژدا ( بنی عبدالاشهل )موسڵمان بوون بە پیاو و ژنەوە ، لە دوای موسڵمان بوونی ( سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ) ، هیچ کەسێکیان نەماو ئەوا موسڵمان بوو ، ( عەمرو کوڕی ثابت کوڕی وقش ) نەبێت ، موسڵمان بوونی دواکەوت ، تا جەنگی ( ئوحد ) لە کاتێك دوو دڵ بوو لە قەبووڵ کردنی ئیسلام ، هەتا میللەتەکەی داوایان دەکرد بۆ ئیسلام و ئەویش دەیگوت :-

ئەگەر بمزانیبا ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاستە لێی دوا نەدەکەوتم .

کاتێك جەنگی ( ئوحد ) هات سنگی ( عەمرو ) جۆش درا بۆ ئیسلام و ، خودا ڕوناکی ئیمانی خستە نێو دڵیەوە و بەخێرایی چەکەکەی هەڵگرت و ، ڕووی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ ، موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کردو ، چووە نێو ڕیزی موجاهیدان ، جەنگی کرد تا بریندارێکی سەخت بوو ، کاتێك لە نێو کوژاو و بریندارەکان بینییانەوە لە نێوان ژیان و مردن بوو ، هەندێك لەمانەی کەوا بە موسڵمان بوونیان نەزانیبوو گوتیان :-

چی تۆی هێنا بۆ ئێرە ئەی ( عەمرو ) ؟

گوتی :-

ئیسلام منی هێنا بۆ ئێرە ، بڕواییم هێنا بە خواو پێغەمبەرەکەی و ، دەستم دا شمشێرم و ئامادە بووم ، خودای گەورە شەهادەتی پێبەخشیم ، ئەوەبوو ( عمرو ) لەبەرچاویان مرد پێش ئەوەی یەك کڕنۆش بۆ خوا ببات ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

(( ئەوە یەکێکە لە بەهەشتییەکان ! ))

لەبەر ئەوە کاتێك ( ئەبو هورەیرە ) خەڵکی لە دەورە بوو گوتی :-

ناوی پیاوێکم پێ بڵێن چووبێتە بەهەشت و یەك سوجدەی بۆ خودا نەبردبێت ؟

خەڵکەکە بێدەنگ بوون ، ( ئەبوهورەیرە ) گوتی :-

ئەمە برای ( بنی عبدالاشهل . عەمرو کوڕی ثابت کوڕی وقشە ) !

هەروەك سیرە بۆمان دەگێڕێتەوە لە نەوەی ( عبد الاشهل ) یەك دووڕوو لە پیاو و ئافرەت نەبووە ، بەڵکو هەمووی پاك و دڵسۆزی ئیسلام بوون ، خوا لە هەموویان ڕازی بێت ، هەروەها بنەماڵەی ( عەمرو کوڕی ثابت ) بنەماڵەی شەهادەت بوون ، هەروەك مێژوو لە باوکی بۆمان دەگێڕێتەوە :- ( ثابت کوڕی وقش کوڕی زغبة کوڕی زعوراء کوڕی عبدالاشهل ) ئەم پیاوە یاوەرێکی پێغەمبەر ﷺ بووە و لە جەنگی ( ئوحد )

پیرێکی بەساڵاچوو بوو ، لەگەڵ ( حوسەیل کوڕی جابر ) یان دانا ئەمەش پیاوێکی بەساڵاچوو بوو لەگەڵ منداڵ و ئافرەتان مانەوە

ئەم دوو پیرە هەستیان بە ئازاری ئامادەنەبوونیان لە جیهاد کرد ، هەر برایەکیان بە ئەوی تریانی دەگوت :-

چاوەڕێی چی بکەین ، ئێمە پیر بووین ئەمڕۆ یان بەیانی هەر دەمرین ، با بگەین بە موسڵمانان تا شەهادەتمان پێ دەبەخشرێت ، لە ڕیوایەتێکی تر دەڵێت هەر یەکێکیان بە هاوەڵەکەی خۆی دەگوت :-

تەنها نێوانی دوو فڕە ئاو گوێدرێژ ژیانمان ماوە ، ئیمڕۆ یان بەیانی هەر دەمرین ، بۆچی شمشێرە هەڵنەگرین ، پاشان نەگەین بە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵکو خوا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شەهادەتمان پێ دەبەخشێ

هەردوو هاوڕێ دەرچوون بۆ جەنگ ، ( ثابت کوڕی وقش ) لە گۆڕەپانی ( ئوحد ) بە شەهیدی کەوت

لە جەنگی ( ئوحد ) لە بنەماڵی ( ثابت ) چوار کەس شەهید بوون ، ئەمانەش :-

( ثابت کوڕی وقش )و ، براکەی رفاعەی کوڕی وقش ) و ، کوڕەکەی سەلەمەی کوڕی ثابت کوڕی وقش )و ، ( کوڕەکەی عەمرو کوڕی وقش ) !!

ئەم بنەماڵەیە بوونە بنەماڵەی جیهادو شەهادەت ...!

ئەم شەهیدە بەڕێزانە ( مخیرق )ی جولەکەمان بەیاد دەهێنێتەوە کەوا یەکێك بوو لە زاناکانی جولەکە بەڵام بە ڕوناکی ئیسلام هیدایەت لە سینگی هەڵگیرسا و پێش جەنگی ( ئوحد ) ، ڕۆژی شەممە بە میللەتەکەی خۆی گوت ، ( پێغەمبەری خواش ﷺ لە - ئوحد - بوو ) :-

ئەی کۆمەڵی جولەکە ، سوێند بەخوا ئێوە دەزانن موحەممەد ﷺ پێغەمبەرە و ، یارمەتیدانی لەسەر ئێوە ڕەوایە ...

گوتیان :- خاکت بەسەر ئەم ڕۆژە ڕۆژی شەممەیە ..

بەبڕواییەوە گوتی : شەممە نییە

پاشان بە پەلە دەستیدا چەکەکەیو ، لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادەی جەنگ بوو ، پێی کەوت ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی گوتی :-

( مخیرق ) باشترینی جولەکەکان بوو ..

خوای گەورە ڕازی بێت لە کۆمەڵی ئیمان و هەق و هیدایەت .

* * *

{ ٧٩ }

# ﴿ صەفوانی کوڕی موعەطــەل ﴾
# شەهیدی خەوخۆش

لــە بەخششــەکانی خــوای گــەورە بــۆ بــەندەکانی ئەوەیــە کــەوا زۆر دەرگــای چاکــەو جۆرەها بەخشینی لەسەر کردۆتەوەو ، پاداشتیان دەداتەوە ، هەتا لەسەر کردەوەی کەمو بەرێز لە کردارو خواپەرستنەکانیان :-

﴿ ان الله لا یضیع أجر مــن أحســن عمــلاً ﴾ ، لەگەڵ ئەمەش هەموو ئەم کردارانە دەژمێرێت و دەیپارێزێت و ڕێزی لێدەنێت کە ڕۆژانە بەندە دەیکات ، لەبەر ئەوەی خودای گەورە زاناو ئاگادارە و دەوری هەموو شتێکی داوە :-

﴿ وأحــاط بـمــا لــدیهـــم و أحـصـــی کـــل شیء عـــدداً ﴾ .

هەروەها خودای گەورە بە بچووکی و کەمی سەیری هیچ مافێك و چاکەیەك ناکات هەرچەندە کەمیش بێت :

﴿ فمـــن یعـــمـــل مثقـــال ذرة خـیـــراً یـــــره ﴾ .

نموونەی ئەم مەبەستەش ، هەروەك جیهاد دەبینین زۆر کرداری هەیەو ، زۆر کەس گومانی وا دەبەن ھەندێ لەم کردارانە بە چاوێکی سووك تەماشا دەکەن ، لەگەڵ ئەمەش هەر کردارێك و چالاکیەك مرۆڤ لە خزمەتی جەنگ بەکاری بهێنێت چ بە زمان بێت یان دەست یان چاو یان گوێ یان بیروباوەڕ ، ئەوا مانای بەشداری کردووە لە جیهاد ، خاوەنەکەی پاداشتی چاکی دەدرێتەوە و یادی بەخێر دێت .

ئەوەیە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرەکانی لە جۆرەها کاروباری جیهاد بەرێ دەکات ، لە نێوان بچوك و گەورە ، بەرزو ئاشکراو ، ماددی و گیانی ، هەر یەکێکیان هەڵدەستێت بە کردارێك پێی سپێردراوە بە دڵسۆزییەکی بێوێنە و باشترین گوێ ڕایەڵی ...

ئەم قوتابیانەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی یەکتریان نەدەکرد لەسەر ئارەزووی دونیایی و ، هەوڵی غەنیمەت کۆکردنەوەیان نەدەداو ، پابەند نەبوون بو ڕیابازی و پلەوپایە ، بەڵکو دەتبینی یەکێك لەوانە خزمەتی برا موجاهیدەکانی خۆی دەکردو ، ئەم شتەی بەگران و سووك نەدەزانی ، پاشان دەتبینی لە جەنگێکی تر لە نێو ڕیزی موجاهیدان جەنگ دەکاو ، بەبێ ئەوەی دوودڵی بکات و بەدوا بکەوێت یاخود گوێی پێ بدات ..

هەموو ئەمانەش بەڕاستی ئیمان بەخواو جیهاد بۆ خوا کارکردن بە دڵسۆزی لە پێناوی خوا زاڵ بووبوو بەسەریاندا ئەو پاداشتەی لای خوایان هەڵبژارد بوو نەوەك ئەوەی لەلای خەڵکە ، بەسووك تەماشای کارەکانیان نەدەکرد و نەیاندەزانی ڕیایی چییە ، هەرچەندە کارەکانیان کەمو بچوك بوایە .

ئەگەر بە هێز لە نێوانیاندا بیتوانیبا چالاکییەکی گەورە و دیار پێشکەش بکات ، هەر لەم ساتەش دا بە چاوێکی سوك تەماشای مافی برایە بێهێزەکەی خۆی نەدەکرد ، لەبەرئەوەی پێغەمبەرەکەیان ﷺ فەرموویەتی :-

(( ئێوە بە بێهێزیتان سەردەکەون ))

ئەم پەندەشمان لە قوتابخانەی موحەممەدی مەزن ﷺ وەرگرتووە ، ئەم نموونەش دەرازێنینەوە بە یادی یاوەری موجاهیدی بەڕێز : باوکی عەمرو صەفوان کوڕی موعەطل کوڕی رخصە کوڕی مؤمل ی سولەمی ذەکوانی هەروەکو ( ابن الاثیر ) دەڵێت (( صەفوانی لە گەورە پیاوانی موسڵمانانە ))

( صەفوان ) - خوا لێی ڕازی بێت -تووشی نەخۆشی خەوگرانی بووبوو ، هەر کە خەوی لێبکەوتایە خەوێکی قوڵ و دوورو درێژی دەکرد نەیدەتوانی تێیدا بە ئاگا بێت تەنها پاش کاتێکی درێژ نەبێت و ، ڕۆژی بەسەردا دەهات لە کاتێك خەوتبوو ، نوێژی فەرزی بەیانی لە دەست دەدا ، پێغەمبەری خوا ﷺ کارەکەی بۆ ئاسان کردبوو ، پێی دەفەرموو :-

ئەگەر بە ئاگا هاتیت نوێژەکەت بکە

خێزانەکەی دەیویست چارەسەری ئەم نەخۆشییە بکات بەڵام نەیدەتوانی ، ڕۆیشت سکاڵای بردە خزمەت پێغەمبەری خوا و گوتی :-

ئەم پیاوە خەوی گرانەو نوێژەکانی لەکیس دەچێت

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

(( ئەمە شتێکە خوا بەسەری هێناوە ، ئەگەر لەخەو هەڵسا با نوێژەکەی بکات ))

( صەفوان ) شاعیرش بوو بەڵام شیعرەکانی بەکارنەدەهێنا لە شتی پڕوپووچی و ئارەزووی دونیای بەڵکو گیانی ئیمانی و ڕەوشتە ئیسلامییەکەی پێ دەرازاندەوە

( صەفوان ) - خوا لێی ڕازی بێت - زۆر توندو تیژ بوو لە ڕق لێبوونەوەی شتە حەرامەکان ، هەر کاتێك ڕقی هەڵسابایە ئەم هۆنراوەی دەگوت :-

تلق ذباب السيف عني ، فإنني غلام اذا هوجيت ليس بشاعر

پێغەمبەری خوا ﷺ ( صەفوانی کوڕی موعەطل )ی زۆر خۆشدەویست و ، بەزەیی پێدا دەهاتەوە ، جارێکیان ( سەعدی کوڕی عوبادە - خوا لێی ڕازی بێت - جلێك دەدات بە ( صەفوان ) و ئەویش لەبەری دەکات ، کاتێك پێغەمبەری خوا ئەم جلەی لەبەر ( صەفوان ) بینی پرسیاری لیکردو فەرمووی :-

(( کێ ئەم جلەی لەبەرکردیت خودا لە بەهەشت پۆشتەی بکات ؟ ئەویش هەواڵی پێگەیاند

( صەفوان )ی موجاهید بەشداری جەنگەکانی کردووە ، جەنگی ( مریسیع ) و ، جەنگی ( خەندەق )و دیمەنەکانی تری بینیوە ، هەروەها ئامادەی فەتحی ( دیمەشق ) بووەو ، لە وڵاتی شام جیهادی کردووە لەگەڵ وڵاتی فارس

( صەفوان ) هەر لە یەکەم قوناغەدا کاری دوای سوپای پێسپێردرابوو کەوا لە دوای کاروانەکانیان بڕوات بۆ هەڵگرتنەوەی هەر کەلوپەلێك کەوتبا لێیان هەروەك سیرە دەڵێت :-

( لــه دوای لەشــكر دەمايـــەوەو ، هـــەر كەل‌وپـــەلێك لـــە موســـڵمانانْ بكـــەوتبا هەڵیدەگرتەوەو تا پێیان دەگەیشت )

ئەم كارەی بە ( صەفوان ) سپاردرا نیشانەی ئەوەیە ئەم یاوەرە بەڕێزە گەورەترین جێگای متمانەو دەست پاكی‌و داوێن پاكی‌یە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ

هەروەك دەگێڕنەوە یەكەم جەنگ كەوا ( صەفوان ) بەشداری تێدا كردووە جەنگی ( بني المصطلق ) بووە كەوا لقێك بوو لە ( خزاعه ) ، هەروەها جەنگی ( المريسيع )یشی پێ دەڵێن ، ئەمەش ناوی ئاوێكە لە ئاوەكانی ناوچەی ( قديد ) لە سنوور ، هـەروەها جـەنگی ( الاعـاجيب )یشیان پـێ دەگـوت ، لەبـەر ئـەوەی چـەند كـاری سەرسـوڕمانی لەناو ڕوودا

ئەم جەنگە سالّی چواری كۆچی بوو ، هەندێك دەڵێن ساڵی پێنج بوو ، هـەروەها لـە دووی مانگی شەعبان بوو ، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ كەوا ( بني المصطلق ) خۆیان كۆكردۆتەوە بۆیان ، سەرۆكەكەیان ( الحارث كـوڕی ابـي ضـرار )ە ، پێغەمبـەر بۆیـــان دەرچـــوو لەســـەر ئـــاوی ( المريســـيع ) پێیـــان گەیشـــت ، خـــودای گـــەورە پێغەمبەرەكەی‌و یاوەرەكانی سەرخست

لەم جەنگە ( صەفوان )ی بینی دایكی‌و دایكی بڕوادارن ( عائشه ) - خوا لێ‌ی ڕازی بێت - لـە كاروانەكە دواكەوتووە . سواری سەرپشتی وشترەكەی خۆی كـردو جڵـەوی وشترەكەی بـۆ گـرت تـا گەیشـتە مەدینـە ، كـاتێك خـەڵكی ( إفـك ) بوختـان‌و قسـەی هەڵبەستەیان دروست دەكرد بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهەقی ( صەفوان ) دەیفەرموو:-

(( سوێند بـەخوا لـە چاكـە بـەدواوە هیـچ شـتێكی تـرم لـێ نەبیستووە ، هـەروەها دەربارەی دەیفەرموو :-

(( سوێند بەخوا لە ژیانی خراپەم لێ نەبیستووە ))

خـودای گـەورە لەســەر زمـانی پێغەمبەرەكـەی شـەهادەی پـاكی بـە ( صـــەفوان ) بەخشی ، ئەمەش باشترین بەڵگەیە

﴿ ومـا ينـطـق عـن الـــهـوى ان هـو الا وحـي يوحـــى ﴾

ئەم شەهادە و بەڵگەنامەش دوبارە ( تأكيد )ی لەسەر دەكرێتەوە كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ‌ی لە پیاوێك دەبێت ڕەخنەو نەنگ لە ( صەفوان ) دەگرێت‌و باسی دەكا پێغەمبەری خوا ﷺ رقی هەڵدەستێ‌و لەم پیاوە نەفرین چی‌یە و دەفەرموێت :-

(( ئایـا ڕەخنـەو نـەنگ لـە نەتـەوەی مـن دەگریـت خـودای گـەورە هیدایـەتی داون بۆ ئیسلام ؟ ))

هـەروەها نیگا هاتە خوارەوە بەرامبـەر بە پاكی‌و دروستی قسەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ چەند ئایەتێك لە سورەتی نور دابەزی لەسەر پاكی كچی ( صديق )و ، بێ‌تاوانی یاوەری خواپەرستی پاك ( صەفوانی كوڕی موعەطـەل ) - خوایان لێ ڕازی بێت -

( صـەفوان ) لەم كارە هێمنانە گواسترایەوە بۆ جەنگـەكان ، واتـە لـە كۆكردنـەوەی كەل‌وپەلی سوپا بوو لە دواوەو ، گەڕانەوەی بۆ خاوەنەكە بۆ بەشداری‌كردن لەم جەنگە گەورەیە ، هـەروەك سیرە بۆمان دەگێڕێتەوە كەوا چینێك لە دوژمنانی خوا دوژمنـانی پێغەمبەرەكـەی ﷺ لـە لای قەڵایـەك بـە نـاوی ( فـارع ) كۆبوونـەوەو قسـەی خراپیـان دەرهەق پێغەمبەرو ئیسلام دەكرد

پێغەمبەری خوا ﷺ بەوانەی دەوروبەری خۆی فەرموو :-
کێ هەیە بۆم بچێتە سەر ( البساط ) لە ( فارع ) ؟!
بە پەلە ( صەفوان ) گوتی من بۆیان دەردەچم ئەی پێغەمبەری خوا
بە تەنهاو بەتەنها بۆیان دەرچوو و ، شمشێرەکەی هەڵگرتو بڕیارو نیازی وابوو بە تەنها بیانگاتێ و ، یان دەستی بیانگاتێ و پەندێکی چاکیان بداتێ یاخود بە پلەی شەهادەت بگات

کاتێك کۆمەڵە خراپەکارەکە بینییان وا پیاوێك شمشێری هەڵکێشاوەو ، هەروەك بروسك رووبەڕوویان دێت و خراپە لە نێو چەوانی دیارە ، لە ترسان تۆقین و قاچەکانیان لەهەوا باڵی گرت

( صەفوان ) هەر لە جیهاد بەردەوام بوو ، بەشداری کرد لە دیمەنە جیهادییەکان لە وڵاتی شام و ، ئامادەی فەتحی ( دیمەشق ) بوو ، پاشان وەکو موجاهیدێك دەرچوو بۆ جەنگی ( ئەرمینیا ) لە ساڵی نۆزدەی کۆچی ، فەرماندەی سوپا ( عثمان کوڕی ابی العاص ) بوو ، هەروەها چەند ئەمیرێکی یاریدەدەری لەگەڵ بوو ، یەکێك لەوانە ( صەفوانی کوڕی موعەطەل ) بوو

لەم ڕۆژەدا ( صەفوان ) جیهادێکی بێوێنەو چاکی کرد ، تا پێیەکانی کوترا ، بەڵکو برینداربوو و شکستی خوارد ، بەم جۆرە مایەوە لەسەر جیهادو تێکۆشان تا پلەی شەهادەتی بەدەست هێنا

بەم جۆرە بینیمان ( صەفوان ) لە ژیانیدا وێنەی موسڵمانێکی ( مطوع ) گیان فیداکاری نیشان دا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێدەکرد ، دوودڵی نیشان نەدەدا . لە هەر کارێك پێیان بسپاردرایە و جەنگ پێویستی پێ هەبوایە ، دوودڵی نەدەکرد ، کاتێك بانگهێژ بانگی بکردبوایە بۆ شوێنی بەرخوردان و گیان فیداکاری یان هەر کارێك ئەگەر چی سووك و بچووکیش بوایە ، ئەم یاوەرە لە کۆمەڵێك بوو خودای گەورە دەستی بە بەزەیی هێنا بوو بەسەر سینگ و بەرۆکیاندا و خۆشەویستی دونیا و پلەوپایەو ڕیابازی لە دڵ هەڵگرتبوون . ژیانی پیرۆزیان بە خواپەرستی و دڵسۆزی و هیدایەت دەبردە سەرو ئەمانە ئەوەی
﴿ خیـــر امـــة أخــــرجـــت للنـــــاس ﴾ بوون

بەڵێ پیاوی مەزنی ڕێزلێگیراو ئەو کەسەیە خوای گەورە لێی ڕازی بێت و بە قەبووڵ کردنەکی چاك قەبووڵی بکات ، هەتا ئەگەر نەزان و هەژاریش بێت ، هەروەها پیاوی سپڵەو دەغەڵیش ئەوەیە خوای گەورە لێی تووڕە بێت و بێبەشی بکات لە بەخششی ڕازی بوون و قەبووڵ کردن ، ئەگەر پیاوێکی توندوتیژ بێت و یاخود پیاوێکی تۆزاوی و جلوبەرگ دڕا بێت ، کاتێك سوێند بخوات لەسەر خودا سوێندەکەی قەبووڵ دەکات ، هەروەکو گەورەی مرۆڤ پێغەمبەرمان ﷺ فەرموویەتی
خودای گەورە ڕازی بێت لە شەهیدی خەوخۆش ( صەفوانی کوڕی موعەطەل )

٨٠

# ئەبو موسای ئەشعەری

## ئەو یاوەرەی دڵسۆز بوو بۆ ئیسلام لە هەموو مەیدانەکان

## { ٨٠ }

# ﴿ ئەبو موسای ئەشعەری ﴾

## (( ئـەو یاوەرەی دڵسـۆز بوو بۆ ئیسـلام لـە هەمـوو مـەیدانەکان ))

لەوانەیە بڕوادار لەشیلەڕو لاواز بێت ، بەڵام لە تێگەیشتن و زانیاری پڕ بێت و ، ئەم لاوازییە بە دڵ و زمانیەتی هەرچەندە دوو ئەندامی بچووکن ...

پیاوی بڕوادار هەموو کات دڵی پاکەو ڕەوشتی باشەو ، نازانێ فرت و فێڵ مانای چییە ، تاکو خەڵکانێك گومانی وادەبەن ، کەوا ئەم مرۆڤە بێئاگاو نەزانە ، بەڵام کاتێك دڵسۆزیان لێ ی بینیەوە ، هێزی قارەمانان و توانای شێریان لێ بەدی دەکەن

لە مێژووی ئیسلامی زێڕین دا نموونـەی بـڕواداری بـەم جـۆرە زۆرەو بـە درێژایـی ڕۆژگار دەمێننەوە ...

یەکێك لەم نموونانە یاوەری بەڕێز :- ( ئەبو موسای ئەشعەری ) یە ، ناوی ( عبدالله کوڕی قەیس کوڕی حضاری کوفی‌یە ، دایکـی ( طیبـة کچـی وەهەبـە ) ، ئـەم ئافرەتـە موسڵمان بوو و کۆچی دوایی کرد .

خـەڵکی ڕەمـەکی هیـچ شـتێك دەربـارەی ( ئـەبو موسـای ئەشـعەری ) نـازانن تەنـها هەڵوێستی ڕۆژی ناوبژیکردنەکـەی نـەبێت لـە نێوان ( معاویـەو ئیمـامی عەلـی ) - خـوا لـێ ی ڕازی بێت - ، وا تەماشا دەکەن دوور بێ نـەبووە بـە هـاتنی بـۆ نـاو سیاسـەت و شـێوەکانی فـرت و فێـڵ ، بـەڵام پـاش چـەند گفتوگۆیـەك بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە ( ئـەبو موسای ئەشعەری ) پیاوی مێژوو جیهادو قارەمانیەتی‌یە .

( ئەبو موسای ئەشعەری ) ئـەم یاوەرەیە پێغەمبـەری خـوا ﷺ مزگێنـی پـێداوە بـە چاکە لە دونیا و قیامەت هەروەك مزگێنی‌دا بە ( بیلالـی کـوڕی ڕەبـاح ) هـەروەها ( ئیمـام بوخاری و موسلیم ) لە فەرمووده ( صحیح )ەکان ئاماژەی بۆ دەکەن ، نازناوی ئەبو موسا بۆ نەتەوەکەی ئەشعەرییەکان دەگەڕێتەوە کەوا خەڵکی یەمەن بوون .

پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوو سیفەتی گرنگی لـە ئەشـعەریە بڕوادارەکان بـەدی دەکـرد ئەمـەش ئازایـەتی و دەسـت پـاکی بـوو ، هـەروەك دەیفـەرموو : { باشـترین کۆمـەڵ ئەشعەرییەکانن ، لە جەنگ هەڵنایەن و خیانەت ناکەن ، ئەوان لە منن و منیش لەوانم }

جگە لەمەش سیفەتێکی بەرزی تریان هەبوو ، ئەمەش یەکسانی بوو لە نێوان یەکتری هەروەك دەفەرمووێت :-

{ ئەشعەرییەکان ئەگەر لە جەنگ خواردنیان کەم بووایە ، یان خواردنیان لە مەدینە کەم ببایەوە ، ئەو خواردنەی لە لایان بوو هەموویان کۆدەکردەوە لەناو پـەڕۆکێك یـان لەناو یەك قاپ بە یەکسانی دابەشیان دەکردەوە ، ئەوان لە منن و منیش لەوانم }

ئـای لەبـەر ئـەو شـانازییە گەورەیـە بـۆ ( ئـەبو موسـا )و میللەتـەکی ، لـە کـاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جارێك دووبارە دەکاتەوە دەڵێت :-

{ فـهـم مـنـي و أنـا مـنـهــم } .

ئەشعەریەکان بەخوێندنەوەی قورئان بەناوبانگ بوون لە کاتە شەودا ،تا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرھەقیان دەفەرمووێت :-

{ مـن دەنگـی نـەرمی ئەشـعەریەکان لــە خوێندنــەوەی قورئــان لـەکاتی شـەودا دەناسمەوە ، بە دەنگی قورئانیان لە کاتی شەودا شوێنیان دەناسمەوە ، لە کاتێك لە ڕۆژدا نەمیبینیون دەچنە ماڵەوە } .

کـاتێك ( ئـەبو موسـای ئەشعەری ) لـە یەمـەن دەچێت بـۆ شـاری ( مەککـە ) ، بـە پێغەمبـەری خوا ﷺ دەگات پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ مەدینـەو ، موسـڵمان بوونـی خـۆی ئاشـکرا دەکـات ، پاشـان بـە ڕێنمـایی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگەڕێتـەوە بـۆ یەمەن ، بۆ ئەوەی مزگێنـی ئـەم ئایینـە نوێیـە بـدات بەمیللەتەکـەی ، لـێرەدا ( موعـاذ کوڕی جەبەل ) یارمەتیدا بۆ بانگ کردنی خەڵك و ڕێنمایی کردنیان .

پاش ماوەیەك ( ئەبو موسـای ئەشعەری ) لە وڵاتەکەی خۆی یەمـەن کۆچی کرد بۆ مەدینـەو ، دەیـەها کەسـی تـری لەگـەڵ بـوو لـە میللەتەکـەی ، خـودای گـەورە بـە هـۆی ئەمـەوە هیدایـەتی دابـوون بـۆ ئیسـلام و ، بـە سـواری دەریـا، ڕەشـەبا بردنـی بـۆ خاکی حەبەشە ، پاشان لەگەڵ ( جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب ) بەرێکەوتن بۆ مەدینە لە ڕۆژی گرتنی قەڵای خەیبەر گەیشتنە مەدینە ، لەبەر ئەوە بە ( ئـەبو موسـای ئەشعەری ) دەڵێن خاوەنی سێ کۆچ .

پێغەمبـەر ﷺ زۆر کـەیف خـۆش بـوو بـە گەیشـتنی ئـەم کـۆچ کردووانـە و، چـەند جاران سوپاسـی کـردن و بەشـی پێدان لـە غەنیمـەکانی خـەیبـەر ، جگـە لـە ئـەمان بەشـی کەسی تری نەدا ..

هەروەك ڕیوایەت دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو موسای کرد بە فەرمانڕەوا لەسەر ( زبیدو عەدەن و قەراغی یەمەن ) لە پاش ئەم ( ئیمامی عومەر ) لەسەر بەصرا کردی بە فەرمانڕەوا و ، ( ئیمامی عثمان ) لەسەر کوفەی دانا .

( ئـەبو موسـا ) پیاوێکی نیـاز پـاك و ، دڵ پـاك و ، خواپەرسـت بـوو ، زۆر بـە ڕۆژوو دەبوو و شەونخونی زۆری هەبوو ، ( ئەبو موسا ) بەدوای ڕۆژانی درێژو گەرم دەگەڕا بۆ ئەوەی تێیدا بەڕۆژوو بێت و ، خۆی تێدا ڕابهێنێ زیاتر ئارام و خۆڕاگر بێت .

لەگەڵ ئەمـەش دەستێکی باڵای هـەبوو لـە جیـهاد ، خـاوەنی ئازایـەتی و خۆڕاگـری بوو ، تاکو دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ دەرھەقی فەرموویەتی :-

{ گەورەی سوارچاکان( ئەبو موسای ئەشعەری )یە } .

( ئــەبو موســا ) بەشــداری جــەنگی ( ذات الرقــاع ) کــرد لەگــەڵ پێغەمبــەری خـوا ﷺ ، ئەمـەش دیمـەنێك لـە دیمەنـەکانی خۆڕاگریمـان نیشـان دەدات ، لـە سـاڵی چواری کۆچی ، دەربارەی ئەم جەنگە ( ئەبو موسا ) دەڵێت :-

لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ جەنگێك ، ئێمە شـەش کـەس بووین بـە نـۆرە سـواری ئەسـپ دەبوویـن ، پێیـەکانمان کوتــراو ، نینۆکــەکانمان هــەمووی

هەڵوەری ، پەڕۆکمان لە پێیەکانمان دەپێچا ، ناویان لەم جەنگە نا جەنگی ( ذات الرقاع ) لەبەر ئەوەی لە ناخۆشیان پەڕۆکمان لە پێیەکانمان ئاڵاند

هەروەها ( ئەبو موسای ئەشعەری ) لەگەڵ مامی ( ئەبو عامر ئەشعەری ) ڕۆیشتن لەگەڵ پۆلێك بۆ ( اوطاس ) – ئەوطاس دۆڵێك بوو لە ئاوەدانی هۆزان – بۆ ئەوەی پەلاماری دوژمنەکانیان بدەن و مامی فەرماندەی پۆلەکە بوو ، دەگێڕنەوە یەکێك لە دوژمنەکان لە پیاوانی ( جەشم ) تیرێکی لە ( ئەبو عامر ) دەدا بە پێی دەکەوێت و پەیی بە برینێکی سەخت .

لێرەدا ( ئەبو موسای ئەشعەری ) بە پەلە پەلاماری تیرهاوێژەکە دەداو دەیکوژێ ، پاشان دەگەڕێتەوە و تیرەکەی لە پێی مامی دەردەهێنێ ، بەلام ( ئەبو عامر ) پاش کەمێك هەستی کرد بە نزیك بوونەوی مردن ، ( ئەبو موسا )ی لە شوێنی خۆی کرد بە فەرماندەی پۆلەکە ، پێی گوت :-

بڕۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سەلامی منی پێڕابگەیەنەو پێی بڵێ :- داوای لێخۆشبوون بۆ ( ئەبو عامر ) بکە !

( ئەبو عامر ) هەناسەی دوایی داو ، بە شەهیدی بەرەو بارەگای خوا بەڕێ کەوت – خوا لێی ڕازی بێت – .

( ئەبو موسای ئەشعەری ) گەڕایەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، هەواڵی ئەوەی پێدا کە ڕووی دابوو ، باسی تکای مامی کرد بۆ دوعای پێغەمبەر ﷺ ، هەروەکو سیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ هەڵساو دەستنوێژێکی شوشت ، پاشان دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی :-

پەروەردگارا لە ( عبید ) باوکی ( عامر ) خۆش ببە ،پەروەردگارا لە ڕۆژی دوایی لە سەرووی زۆربەی دروست کراوەکان داینێ .

( ئەبو موسای ئەشعەری ) ئەم دەرفەتەی بەهەل زانی و گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوون بۆ منیش بکە .

پێغەمبەری خوا ﷺ داواکەی ( ئەبو موسای ئەشعەری ) ڕەت نەکردەوەو فەرمووی :-

پەروەردگارا لە ( عبداللەی کوڕی قەیس ) ( ئەبو موسای ئەشعەری ) خۆش ببەو ، لەڕۆژی دوایی لە جێگایەکی بەرێز دایانبنێ

بەم جۆرە ( ئەبو موسای ئەشعەری ) کەموکورتی نەکردووە لە جیهادی ڕێگای خوا ، بەڵکو ئەهوازیلە وڵاتی فارس ڕزگار کرد .... پاشان لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو تاکو هەموو وڵاتی خوزستانی ڕزگار کرد

شاری ( اصفهان )ی لە ساڵی بیست و سێی کۆچی ڕزگار کرد ، لەگەڵ خەڵکەکە ڕێککەوت لەسەر دانی ( جزیە ) بە گوێرەی ویست و ئارەزووی خۆیان ، کاتێك نەیانویست فێڵ لە ( ئەبو موسای ئەشعەری ) بکەن و خیانەت بکەن ، ( ئەبو موسا ) چووە سەریان و دەرسێکی باشی پێدان ، هێنایانەوە سەر ڕاستە ڕێ .

هەروەها ( ئەبو موسای ئەشعەری ) فەرماندەی ئەم لەشکرە بوو کەوا هەڵسا بە جەنگی ( توستەر ) لە گەورەترین شارەکانی فارس ، لە لای دەستە ڕاستی ( ئەبو

موسا ) ، ( بەرائی کوڕی مالك ) بوو ، لە لای چەپی سوپاکەی( مەجزەئەی کوڕی ثەوری سەدوسی ) بوو ، سوارچاکان ( ئەنەسی کوڕی مالك ) بوو ، یارمەتی بە ( عەماری کوڕی یاسر ) بۆ هات کەوا لای ڕاستی ( بەڕائی کوڕی عازب ) بووو ، لە لای چەپی ( حوذەیفەی کوڕی یەمان ) بوو ، سوراچاکان ( قرطەی کوڕی کەعبی‌ئەنصاری ) بوو ، هێزی پیادە ( نەعمانی کوڕی موقەڕین ) بوو .

( ئەبو موسا ) پاش جیهادێکی درێژ بە پیلانێکی سەربازی توانی ئەم شارە ڕزگار بکاتو ، فەرماندەی سوپای دوژمن ( هورموزان ) بە دیل بگرێت

لەگەڵ ئەمانەش ( ئەبو موسا ) مامۆستای قورئان خوێندن بوو ، لە یەمەن و لە بەصرا خەڵکی فێرە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەکرد ، هەتا دەیگوتە خەڵکەکە کاتێك بازنەی قورئان لەبەرکردنیان دەبەست :-

{ ئەمیری بڕوادران ( ئیمامی عومەر ) منی ڕەوانەی‌لای ئێوە کردووە کتابی خواتان فێر بکەم لەگەڵ سونەتی پێغەمبەرەکەتان ﷺ ، هەروەها ڕێگاتان بۆ پاك بکەمەوە }

( ئەبو موسا ) قورئان خوێنەکانی کۆکردەوەو پێی گوتن :-

ئێوە خوێنەری ئەم شارەن ، نەکەن ماوە زۆر بدەن بۆ قورئان خوێندن ، دڵتان ڕەق ببێت ، هەروەك دڵی ( ئەهلی کیتاب ) ڕەق بوو .

( ئەبو موسا ) دەنگێکی سەرسوڕهێنەرو سەرنج ڕاکێشەری هەبوو لە خوێندنەوەی قورئان ، بە تایبەتی کاتێك دەنگی خۆی بەرز دەکردەوەو قورئانی بە ( ترتیل ) دەخوێندەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموو :-

{ بەڕاستی دەنگێکی خۆشت دراوەتێ لە دەنگە خۆشەکانی ال داود } .

پێغەمبەر شەوێکیان گوێی لە دەنگی خوێندنەوەی دەبێت ، پاشان کاتی بەیانی پێی گوت :-

ئەی ( ئەبو موسا ) دوێنێ لەگەڵ ( عائیشە ) بەلای تۆدا تێپەڕین ، تۆ قورئانت دەخوێندەوە ، هەڵساین گوێمان دا خوێندنەوەکەت ... گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، من ئەگەر دەمزانی بە جێگات بە شێوەیەکی جوانتر قورئانم دەخوێندەوە ... !!

( عومەری کوڕی خطاب ) زۆر حەزی دەکرد گوێی لە خوێندنەوەی قورئان بێت لە ( ئەبو موسای ئەشعەری ) ، پێی دەگوت :

ئەی ( ئەبو موسا ) ، یادی خوامان بە بیر بهێنەوە ....

( ئەبو موسای ئەشعەری ) گوێڕایەڵی دەکردو قورئانی بۆ دەخوێندەوە ، ( ئیمامی عومەر )و ئەوەی لەگەڵی بوون بەبێ دەنگیو مل کەچی‌یەکی زۆر دادەنیشتن و گوێیان دەگرت ...

لەگەڵ ئەم قارەمانیەتیەی لە جیهادو ، دەنگەشیرینە ، ( ئەبو موسا ) یەکێك بوو لەم چوار کەسەی ناوبانگیان دەرکردبوو لە فتواندانو قەضاوەت ، ئەمانەش :-

( ئیمامی عومەر ، ئیمامی عەلیو زەیدی کوڕی ثابت و ئەبو موسای ئەشعەری ) بوون - خوا لێیان ڕازی بێت -ئەوەی جێگای سەرسوڕمانیش نیە لەگەڵ ئەم

هـەموو چـالاكی‌و ماندووبوونـە ( ئـەبو موسـا ) سـێ‌صەدو شەسـت فـەرموودەی لـە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوەتەوە .
هەروەها ( ئەبو موسا ) بەبێ‌ڕادە بە شەرم بووە لە پەروەردگار ، هەتا دەڵێت :-
مـن لـە شـەوانی تـاریك غوسـلم دەردەكـرد و پشـتی خـۆم ڕاسـت نـەدەكردەوە ، تـا جلەكانم لەبەر دەكرد ، لەبەر شەرمی خوای گەورە .
ئینجا ( ئەبو موسا ) لەگەڵ ئـەم هـەموو سیفەتە بەرزانـەی هـەیبوو هـەر هـەمووی نیازی پاكی بەرزكردنـەوەی ووشـەی خودا بوو ، دژی ئـەم سـوپایە بـوو كـەوا دەیویسـت ڕونـاكی خـوا لەسـەر زەوی بسـڕێتەوە ، بـە هـەموو توانایـەك هـەڵدەهات لەشـەڕی نێـوان موسـڵمانان ، ( ئـەبو موسـا ) هیـچ دەورێكـی تیـا نـەدەبینی تەنـها دەوری ناوبژی‌كردن نەبێت ...
ئەم دەورەی ناوبژی‌كردنەی بینی لە نێوان ( ئیمامی عەلی‌و معاویە ) دەمانگەیـەنێت بە خاڵێك كەوا ( ئەبو موسا ) لە دەروونی‌زیادەڕەوی كردووە تا گەیشتۆتە ڕاددەیـەك بە ئاسانی فێڵی لـێ‌بكەن ... بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بۆمـان دەردەكـەوێت ئەم یاوەرە چـەند بەرزەو ج بڕواییەكی هەیە بە هەق‌و بە مافی خەڵك ... هـەروەها بیروڕای ( ئەبو موسـای ئەشـعەری ) لـە مەسـەلەی نـاوبژی‌كردن ئـەوەبوو دەیبینـی موسـڵمانان یـەكتری دەكوژن ، هەر چینێك لایـەنگری پێشـەواو فەرمانڕەوایـەكن ... هـەروەها دەیبینـی ئـەم شەڕە چارەنووسی ئیسلام دەگەیەنێت بەسەر لێواری ڕووخان ...
ئـەم شـەڕە ناوخۆیی‌یـەی ئـەم ڕۆژگـارە كـەوا دەسـووڕێتەوە لـە نێـوان دوو چـین لـە موسڵمانان بۆ هێنانی یەكێك بۆ سەر تـەخت ، بە بیروڕای (ئەبو موسا ) باشترین چارە ئەوە بوو ، ( ئیمامی عەلـی ) - خوا لـێ‌ی ڕازی بێـت - ( مۆڵـت ) لەسـەر تـەخت بێتـە خـوارەوە ، هـەروەها ( معاویـەش ) بـەم جـۆرە ، بـۆ ئـەوەی ئـەم كـارە سـەر لـە نـوێ موسڵمانان خەلیفە بە ڕێگای ڕاوێژ هەڵبژێرن بەوەی‌حەزی لـێ‌دەكەن ...
بـەم جـۆرە ( ئـەبو موسـا ) گفتوگـۆی لـەم مەسـەلەیە كـردووە ... ئەمـەش چارەسەریەتی ...
ڕاستە ( ئیمامی عەلـی ) - خوا لـێ‌ی ڕازی بێت - موبایەعەی خەلیفایەتیان دایێ بە بەیعەیەكی ڕاست .... هـەموو هەڵگەڕانەوەیەك بەرامبـەر بـە ( ئیمـامی عەلـی ) شـتێكی ڕاست نـەبوو نەدەبوایە ئەم كارە بكرێت مافی ئیمام بخورێت ... بەڵام ئـەم ناكۆكیـەی ( ئیمـامی عەلـی و معاویە )و نێوان خـەڵكی ( عێراق‌و شام ) بە بیروڕای ( ئەبو موسا ) دەبوایە و پێویست بوو بە جۆرێكی نوێ بیری لـێ‌بكرێتەوەو چارەسـەر بكرێت ، یـاخی بوونی ( معاویە ) ، تەنها ئەم یاخی‌بوونە نەبوو ، یـاخی بوونی خـەڵكی شامیشی لەگـەڵ بوو ، ئەم ناكۆكی‌یە تەنها ڕای جیاواز نەبوو لەسەر بیروڕاو هەڵبژاردن ...
بەڵكو ئەمانە هەمووی بووەهۆی دروست بوونی جەنگێكی ناوخۆیی هـەزارەها كـەس بوونـە قوربانی لە نێوان ئەم دوو چینـە ، بـەردەوام ئـەم كارەسـاتە تـەهدیدی ئیسـلام‌و موسڵمانانی دەكرد بە خراپترین چارەنووس ..
بـەڕای ( ئیمـامی عەلـی ) پێـش كـاری نـاوبژی كـردن ئـەوەبوو ( عبداللـەی كـوڕی عەباس ) یـان یـەكێك لـە هاوڕێكانی نوێنـەری ئەم بن ، بەڵام چینێكی زۆر لـە خـەڵك لـە

خاوەن بیروڕاکان ( ئەبو موسای ئەشعەری )یان پێ باشتر بوو ، بە بەڵگەی ئەوەی ( ئەبو موسای ئەشعەری ) بەشداری ئەم ناکۆکی‌یەی نێوان ( ئیمامی عەلی‌و معاویەی ) نەکردووە ، بەڵکو وازی لە هەردوو چین هێناوە پاش ئەوەی نائومێد بووە لە گفتوگۆ و چاك کردنی نێوانیان ...

لێرەدا گومانی ( ئیمامی عەلی ) لە ( ئەبو موسای ئەشعەری ) لە ڕاستگۆیی ودڵسۆزیەکەی نەبوو ، بەڵکو لە نیازی لایەنەکەی تر دەترسا ، لەبەر ئەوەی زۆر پشتیان دەبەست بە فرت‌و فێڵ ...

( ئەبو موسای ئەشعەری ) لەگەڵ شارەزایی‌و زانستی‌ڕقی لە هێنان‌و بردن‌و فرت‌و فێڵ دەبۆوە ، حەزی دەکرد بە ڕاستگۆیی هەڵس‌وکەوت لەگەڵ خەڵك بکات ، لەبەرئەوە ( ئیمامی عەلی ) دەترسا لەوەی فێڵ لە ( ئەبوموسا ) بکەن‌و ، لایەنی تر زیاتر کارەکە بەرەو خراپە ببەن

ناوبژی‌کردنەکە لە نێوان هەردوو چینەکە دەستی پێکرد .

( ئەبو موسای ئەشعەری ) نوێنەری ( ئیمامی‌عەلی ) دەکرد

( عەمری کوڕی عاص ) نوێنەرایەتی ( معاویەی ) دەکرد .

ئەوەی ڕاستی بێت ( عەمرو کوڕی عاص ) پشتی دەبەست بە زیرەکی‌یە بێ‌وێنەکەی‌و پیلانە یەك لەدوای یەکەکانی بۆ وەرگرتنی بیروڕا بۆ ( معاویە ) بەکاری دەهێنا

کۆبوونەوەکە دەستی پێکرد لە نێوان ( ئەشعەری‌و عەمرو ) بە بیروڕای (ئەبو موسا ) هەردووکیان ڕێك بکەون لەسەر هەڵبژاردنی ( عبداللەی کوڕی عومەر ) بەڵکو بیکەن بە خەلیفەی موسڵمانان ، ئەمەش لەبەر ئەوەی ( عبداللەی کوڕی عومەر ) جێگای ڕێزو خۆشەویستی گشت موسڵمانان بوو ...

بەم جۆرە ( عەمرو ) بە زیرەکی خۆی دەرگاکانی مەبەستی خۆی‌کردەوە ، هات ( معاویە )ی هەڵبژارد ، پاشان ( عبداللەی کوڕی عەمرو ) لەبەر ئەوەی ئەویش جێگایەکی مەزنی هەبوو لە نێو ڕیزەکانی یاوەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ

وەنەبێ زیرەکی ( ئەبو موسا ) بێ‌ئاگا بێت لە پیلانەکانی ( عەمرو ) ... کاتێك بینی ( عەمرو ) ڕێبازی پاڵاوتن ( ترشیح ) ناگرێتەبەر یەکسەر پەنای بردە بەر ڕێگایەکی هێمنانەتر ، ئەمجارەیان ڕێبازی ڕاوێژ (شوری )یان گرتە بەر کەوا مافی هەموو موسڵمانێکە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی موسڵمانان ، خودای گەورەش فەرمانی ڕاوێژی لەسەر داناون ...

پاش کەمێکی تر دەبینین چۆن ( عەمرو )ئەم ڕێبازە مەزنە هەڵدەقۆزێتەوە بۆ قازانجی ( معاویە ) ...

بەڵام پێش ئەمە با گوێ بگرین لە دەقی ئەم گفتوگۆیە مێژوویی‌یەی ڕوویداوە لە نێوان ( ئەبو موسا و عەمرو کوڕی عاص ) لە سەرەتای کۆبونەوەکەیان ، ئەم دەقەش وەرگیراوە لە کتابی ( الأخبار الطوال ) دانراوی ئەبو حەنیفەی دەینەوەری :-

ئەبو موسا :-

ئەی عەمرو ، ئایا شتێکت دەوێت چاککردنی ئوممەت و ڕازیبوونی خودای لەناودا بێت ....؟

عەمرو :- ئەمە چی‌یە ...؟

ئەبو موسا :-

( عبداللەی کوڕی عومەر ) بکەین بە خەلیفە ، ئەم پیاوە خۆی نەخستۆتە هیچ شتێکی ئەم جەنگە .

عەمرو :- چۆنە ئەگەر ( معاویە ) بهێنین ...؟

ئەبو موسا :-

( معاویە ) موستەهەق و شایەنی ئەم جێگایە نی‌یە .

عەمرو :-

ئایا نازانی ( ئیمامی عثمان ) بە ستەم لێکراوی کوژراوە .

ئەبو موسا :- بەڵێ

عەمرو :- ( معاویە داواکەری خوێنی( ئیمامی عثمان )ەو ، تۆش دەزانیت جێگای لەناو قورەیش ! ، ئەگەر خەڵك گوتیان بۆچی فەرمانڕەوایی دا دەست و سەرەتای نیە ؟ بۆ ئەمە پاساوت هەیەو ، دەڵێیت :-

من داواکاری خوێنی ( ئیمامی عثمان )م بینی‌یەوە و خواش دەفەرموێت :-

﴿ ومـــن قـتـل مـظـلـومـاً فـقـد جـعـلـنـا لـولـيـه سـلـطـانـاً ﴾ .... !

لەگەڵ ئەمەش برای (أم حبیبە )ەیە خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها یەکێکە لە یاوەرەکانی .

ئەبو موسا :- ئەی عەمرو لە خوا بترسە .

تۆ باسی گەورەیی ( معاویە ) دەکەیت ، ئەگەر خەلافەت بە بنەماڵە بوایە شایەنی ( ئەبرەهەی کوڕی صەباح ) دەبوو ، یەکێك بوو لە نەوەی پاشاکانی یەمەن و یەك لەدوای یەکەکان بوو ، کەوا دەستیان گرتبوو بەسەر موڵکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی ، پاشان گەورەیی ( معاویە ) بەرامبەر ( عەلی کوڕی ئەبو طالب ) ؟!!

بەڵام قسەکەت :- ( معاویە ) خوێن گری ( ئیمامی عثمان ) ... ( عەمرو کوڕی عثمان ) کوڕی ئەمەو لە پێش ئەمە ...

بەڵام ئەوەی من قسەی لەسەر دەکەم ڕێبازی ( عومەری کوڕی خەطاب ) نوێ دەکەمەوە بە هۆی کردنی ( عبداللەی زانا ) بە فەرمانڕەوا ...

عەمرو :- چی قەدەغەت دەکات بۆ کوڕەکەم ( عبداللە ) لەگەڵ گەورەیی و چاکەکاری و کۆچی دێرینی و یاوەریەتی ؟

ئەبو موسا : کوڕەکەت پیاوێکی ڕاستگۆیە ، بەڵام لەم جەنگەت ئاڵاند ، وەرە بە گوێم بکە با پاکی کوڕی پاك بکەینێ و ... ( عبداللەی کوڕی عومەر ) ..

عمرو : ئەی ئەبو موسا ، ئەمە بۆ ئەم کارە ناشێت تەنها پیاوێك نەبێت دوو کارێژی نەبێت ، بە یەکێکیان بخوات و بە یەکێکیان تام وەربگرێت ...

ئەبو موسا : خاکت بەسەر ئەی عەمرو ، موسڵمانان پشتیان لەم کارە بە ئێمە بەستاوە پاش ئەوەی کەوتنە ناویەك بە شمیشێر و ڕم ، با نەیان گێڕینەوە بۆ فیتنە ..

عمرو :چۆنی دەبینی ؟

ئەبو موسا : وای ئێدەڕوانم ئەم دوو پیاوە بهێنینە خوارەوە ( ئیمامی عەلی و معاویە ) پاشان ڕاوێژ لە نێوان موسڵمانان بکەین ، ئەوەی حەزی پێدەکەن بۆ خۆیان هەڵیبژێرن

عمرو : بەم بیروڕایە ڕازیم و ئەم کارە خێری ئەم خەڵکەی تیایە .

ئەم گفتوگۆیەی کرا لە نێوان ( ئەبو موسای ئەشعەری و عەمرو کوڕی عاص ) بۆمان ڕوون دەبێتەوە ( ئەبو موسا ) پیاوێکی بێئاگا نەبووە و ، بەڵکو ئەم گفتوگۆیە زیاتر زیرەکی و ژیری دەسەلمێنێ

کاتێك ( عمرو ) دەیویست ( ئەبو موسا ) بریندار بکات بە هۆی دانانی ( معاویە ) بە خەلیفە بە بەڵگەی ئەوەی جێگای هەیە لە قوڕەیش و ، خوێن گری ( ئیمامی عثمان )ە ، لە لایەن ( ئەبو موسا )ەوە وەلامێکی بێوێنەی پرشنگداری تیژ وەك شمشێر دەدرایەوە

- ئەگەر خەلافەت بە شەرەف و گەورەیی بێت ، ( ئەبرەهەی کوڕی صەباح ) پشتاوپشت پادشایانە و شیاوترە لە ( معاویە ) .

- ئەگەر ( معاویە ) داوای خوێنی ( ئیمامی عثمان ) دەکا و بەرگری لێدەکات ، کوڕی ( عثمان ) - خوا لێیان ڕازی بێت -لەم شتە لەپێشترن و لە ( معاویە ) لە پێشترن بۆ فەرمانڕەوایی .

* * *

ڕێڕەوی مەسەلەی ناوبژیکردن پاش ئەم گفتوگۆیە تەنها ( عمرو کوڕی عاص ) لێپرسراوەتی هەڵدەگرێ ...

هەرچی ( ئەبو موسای ئەشعەری ) بوو ئەم تاوانەی لەسەر خۆی هەڵگرت و خستیە ملی ئوممەت و قسەی خۆیان لێبکەن و خەلیفەی خۆیان هەڵبژێرن ..

بە هیچ شێوەیەك بە خەیاڵی ( ئەبو موسا ) دا نەدەهات کەوا ( عەمرو ) لەم هەنۆیستەی کەوا چارەنووسی ئیسلام و موسڵمانانی خستۆتە کارەسات ، پەنا دەباتە بەر فرت و فێڵ ، هەرچەندە قەناعەتەکی تەواوی هەیە بە ( معاویە ) .

هەروەها ( عبداللەی کوڕی عەباس ) پێش ئەوەی ڕێککەوتنەکە جێبەجێ بکەن ئاگاداری ( ئەبو موسا )ی کردەوە لە هێنانۆ بردنی ( عەمرو )و پێی گوت :-

( سوێند بەخوا دەترسم ( عەمرو ) فێڵت لێبکات ، ئەگەر ڕێککەوتنتان کردووە لەسەر شتێك ئەوی بە پێش خۆت بخە با قسە بکات ، پاشان لە دوای ئەو تۆ قسە بکە )

بۆ ڕۆژی دوایی کۆبوونەوەیان کرد ، ( ئەبو موسا ) نوێنەری لایەنی ( ئیمامی عەلی ) و ( عەمروی کوڕی عاص ) نوێنەری لایەنی ( معاویە ) ...

( ئەبو موسا ) داوای لە ( عمرو ) کرد قسە بکات ... ( عمرو ) قبوڵی نەکردو پێی گوت :-

( من به پێشت ناکەوم و تۆ له من گەورەتریتو ، پێشتر کۆچت کردووه و ، له من به تەمەن تری ) ...!!

( ئەبو موسا ) به پێش کەوت خەڵکێکی زۆر له هەردوو لایەن چاوەڕێیان دەکرد ...

گوتی :- ( ئەی خەڵکینه .. ئێمه واتێمان ڕوانی کەوا ئەوەی خێری ئەم ئوممەتەو چاککردنی کاری تیایه ، هیچ شتێکمان نەبینیووه باشتر بێت له لادانی ئەم دوو پیاوه ( ئیمامی عەلیو معاویه ) ، بیکەن به ڕاوێژ ، خەڵك بۆ خۆی ئەوەی پێیان باشه با هەڵیبژێرن .

(( من ئیمامی عەلیو معاویه )م لادا

( کاری خۆتان بگرنه دەست ئەوەی حەزی لێدەکەن بیکەن به فەرمانڕەوا )

ئینجا نۆرەی ( عەمروی کوڕی عاص ) هات بۆ ئەوەی ئەویش ( معاویه ) لا بدات ، چۆن ( ئەبو موسا ) ( ئیمامی عەلی ) لادا ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنەی له نێوانیان دا ئیمزا کرا بوو ...

( عمرو ) بەسەر مینبەر کەوتو گوتی :-

( ئەی خەڵکینه ، ( ئەبو موسا ) هەروەك گوێتان لێبوو ، هاوڕێیەکەی خۆی لادا ) .

هەرچی منم هاوڕێیەکەی ئەو لادەدەم چۆن ئەو لایدا ، هاوڕێی خۆم دەهێڵمەوە ، ئەو جێگری ئەمیری بڕوادران ( عثمان )ەو داواکاری خوێنیەتی ، باشترین کەسه بچێته جێگای ئەو ... ) ... !!

( ئەبو موسا ) - خوا لێی ڕازی بێت - ئارامی لێبڕاو له ناکاو وەکو ئاگر پەلاماری ( عەمرو )یدا به چەند وشەیەکی توندوتیژ ...

دووباره ( ئەبو موسا ) گەڕایەوه بۆ دوورەپەرێزی ، دەستی به هەنگاو هاوێشتن کرد بۆ مەککه ... بۆ خزمەتی ماڵی خودا ... ئەوەندەی تەمەن مابوو له ژیانی لەم شوێنه پیرۆزەی بردەسەر ...

( ئەبو موسا ) هەر به جێگای متمانەوەو باوەڕی له لایەن هاوڕێیەکانی مایەوەو هەروەك جێگای متمانەو باوەڕی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ .

له تەمەنی هەشتا ساڵیدا گیانه پاکو ڕاستگۆو دڵسۆزو موجاهیدو زاناو خواپەرستو بەڕۆژوو قورئان خوێنەکەی گواسترایەوه بۆ لای پەروەردگار و گەیشت به خۆشەویستەکەی پێغەمبەری خواو ﷺ ، ئەم وشه پیرۆزەی کەوا هەردەم لەسەر زاری بوو تا کۆتایی هەناسەی دەیگووتەوه :

﴿ اللهم أنت السلام و منك السلام ﴾

خودای گەورە له یاوەری خاوەن سێ هیجرەت یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆش بێت و خودای گەورە وابکات ئێمەش پەندیان لێوەربگرینو بیانکەین به سەرمەشقی خۆمان .

* * *

# ناوەرۆك

١- موصعەبی کوڕی عومەیر
٢- ڕافیعی کوڕی خەدیج
٣- حەمزەی کوڕی عبدالمطلب
٤- عەماری کوڕی یاسر .
٥- عوبەیدەی کوڕی حاریث
٦- جەعفەری کوڕی ئەبی طالب
٧- عبدالله ی کوڕی ڕەواحە
٨- زەیدی کوڕی حارثــە
٩- زەیدی کوڕی خەطاب
١٠- خوبەیب کوڕی عەدی .
١١- سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس
١٢- عبدالله ی کوڕی زوبەیر .
١٣- بەڕائی کوڕی مالیك
١٤- عامیری کوڕی فەهیرە
١٥- سەعدی کوڕی ڕەبیع .
١٦-عبدالله ی کوڕیعەمری کوڕی حەرام .
١٧- عەمری کوڕی جەموح
١٨- عاصیمی کوڕی ثابت .
١٩- حاریثەی کوڕی سوراقە
٢٠- ئەبو طلحەی ئەنصاری .
٢١- حوذەیفەی کوڕی یەمان .
٢٢- عثمانی کوڕی مەظعون
٢٣- ئوسامەی کوڕی زەید
٢٤- خەواتی کوڕی جوبەیر .
٢٥- قەتادەی کوڕی نەعمان .
٢٦-سەلەمەی کوڕی ئەکوەعی ئەسلەمی.
٢٧- خالیدی کوڕی سەعید
٢٨- مەجزەئەی کوڕی ثوری سەدوسی
٢٩- سەهلی کوڕی حونەیف
٣٠- عوروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی

٣١- نەعمانی کوڕی موقەڕین
٣٢- عومەیری کوڕی وەهەب
٣٣- عەمری کوڕی عاص
٣٤- سەعدی کوڕی موعاذ
٣٥- حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاری
٣٦- وەحشی کوڕی حەرب
٣٧- عبدالله ی کوڕی عبدالله ی کوڕی نوبەی کوڕی سەلول
٣٨- عەبادی کوڕی بیشر
٣٩- عبدالله ی کوڕی سەلام
٤٠- فەیروزی دەیلەمی
٤١- خالیدی کوڕی وەلید
٤٢- ئەبولوبابە (بەشیری کوڕی عەبدولمونذیر )
٤٣- عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص.
٤٤- ساریەی کوڕی زونەیم
٤٥- موحەممەدی کوڕی مەسلەمە
٤٦- عبدالله ی کوڕی عامر
٤٧- ئەبو ئومامەی باهیلی
٤٨- حوسەینی کوڕی عەلی
٤٩- ( ئەسماء )ی کچی ئەبوبەکر .
٥٠- حوبابی کوڕی مونذیر
٥١- عبدالله ی کوڕی عەبباس
٥٢- بیلال کوڕی ڕەباح
٥٣- هاشمی کوڕی عوتبە
٥٤- صوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمی
٥٥- عاصیمی کوڕی عەمری تەمیمی
٥٦- عبدالله ی کوڕی حوذافــە
٥٧- أم سەلـەمـە
٥٨- طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی
٥٩- سەمورەی کوڕی جوندب
٦٠- ڕەبیعی کوڕی زیاد